صلى الله عليه وسلم

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

چوارەم

# عەلی کوڕی ئەبوطالیب

(رضي الله عنه)

ئامادەکردنی: فـواد تـەوحـیدی






K T E B X A N A Y T W E S H W

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

زۆرجار ئێمەی موسڵمان بەشێکی ژیانمان تەرخان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی، جاری وا هەیە لە بەشێکی ژیاننامەکەدا بەسەرهاتێك کارمان تێدەکات و هەوڵ دەدەین لە ژیانماندا بیکەینە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی بەرپێمان، چونکە مرۆڤ زووتر لەگەڵ ڕووداوە واقعیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاتر کاریگەر دەبێت،

ئەم زنجیرەیە بەم مەبەستە نووسراوە، چۆن هاوەڵان بناسین و دیوەجوان و ڕازاوەکانی ناو ژیانی هاوەڵان شارەزابین و بتوانین پەند و وانەیان لێ وەربگرین و لە واقیعی ژیانماندا جێبەجێ بکەین.

ئەم شێوازی فێربوون و فێرکردنە لە قورئانەوە فێر دەبین، کاتێك خوای گەورە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران، دەفەرموێت: (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)يوسف. (سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە ڕێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و ڕێ نیشاندان و ڕەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

بەویستی الله تعالی درێژە بەم زنجیرەیە دەدەین و هەولدەدین ژیانی زۆربەی هاوەڵان بلاو بکەینەوە بە چەند مەبەستێك:

یەکەم: بزانین کەسانێك توانییان خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، چۆن ژیان و چۆن توانییان ئەو ڕەزامەندییە بەدەست بهێنن.

دووەم: تێبگەین ئەزموونی پەیڕەوی پەیامی خوا ناواقیعی نیە و تەنها لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سنووردار نەبووە، بەڵکو ئەم دینە واقیعیە و دەکرێت مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن، نموونەی یەکەمیشی لە هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە.

سێیەم: کۆی ئەم دینەی ئێستا ئێمەی موسڵمان پێوەی پابەندین، لەلایەن هاوەڵانەوە بەدەستمان گەیشتووە، گرنگە شتێك لەبارەی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیانەوە شارەزا ببین، بزانین ئایا ئەم پەیامەمان لە کەسانی سەرڕاست و ژیرەوە وەرگرتووە؟ یان تەمەنێکە لەخشتەبراوین و بە ناحەق پابەندی ئایینێك کراوین کە کەسانێك بە ویستی خۆیان دایانڕشتووەو سەپاندوویانە.

لەم نووسینەدا، تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەم نموونانەوە بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت و خۆی بەدوای دەیان ناونیشان و سەرەباسی تردا بگەڕێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە هەوڵێکە بۆ دانەوەی مشتێك لە کۆگایەکی قەرزاریمان لە ئاست هاوەڵان، هیوایەکیشە بۆ پێشەنگیکردن بە کەسانێکەوە کە بە دەقی قورئان خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆیان نیشان داوە، ئاواتێکە بۆ سەرهەڵدانەوەی نەوەیەکی نوێی موسڵمان کە بتوانن جارێکی دی پەیامی خوا لە دڵ و واقیع و خاکی سەرزەویدا پیادە بکەن.

# عەلی کوڕی ئەبووطالیب(رضي الله عنه)

ناوی عەلی کوڕی ئەبووطالیبی کوڕی عەبدولموطهلیبی قورەیشی هاشمیە، کونیەکەی ئەبولحەسەنە.

باوکی ناوی ئەبوو طالیب بوو کە پشت و هاوکارێکی گەورەی پێغەمبەر ﷺ بوو، تا دوا ساتی ژیانی پشتگیری پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، بەڵام بە بێباوەڕی کۆچی دوایی کرد.

دایکی ناوی فاطیمەی کچی ئەسەد بوو کە ژنی ئەبوو طالیب بوو ئەم ئافرەتە لە کۆچەران بوو و کاتێکیش وەفاتی کرد پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی خۆی کرد بە کفن و لە ناو گۆڕەکەشیدا راکشا تا خۆڵەکە رێك بوو و فەرمووی بۆیە وامکرد تا جلی بەهەشت بکاتە بەری و لە گۆڕەکەشیدا راکشام تا گۆڕەوشاری لەسەر سووك بێت، دوای ئەبووطالیب ئەم ئافرەتە لە هەموو کەس چاکتر بووە لەگەڵم.

خەزووری کە ئامۆزایشی بوو، پێغەمبەری خوایە ﷺ.

خەسووی ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدە، دایکی باوەڕداران و ژنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، یەکەم کەس بوو کە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ، ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو کە سامانەکەی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەکارهێنا، دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو جگە لە ئیبراهیم کە لە ماریە لەدایك بوو، چاکترینی ئافرەتانی بەهەشتە، سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە وەفاتی کرد.

## براکانی:

برایەکی ناوی طالیبی کوڕی ئەبوو طالیب بوو کە ئەمیان بە بێباوەڕی مرد، هەرچەندە لەگەڵ بێباوەڕان هات بۆ غەزای بەدر، بەڵام پێش جەنگەکە گەڕایەوە بۆ مەککەو بەشداری نەکرد، ئەو بە نابەدڵی هاتبوو بۆیە گەڕایەوە، بەڵام دواتر نە لەناو کوژراواندا بینرا و نە گەیشتەوە مەککە.

برایەکی تری ناوی عەقیل بوو، برای عەلی بوو، واتە تەمەنی لە عەلی زیاتر بوو.

ئیبن سەعد دەڵێت عەقیل لە ساڵی هەشتی کۆچیدا کۆچی کرد بۆ مەدینەو موسڵمان بوو وبەشداری غەزای موئتەی کرد، دواتر نەخۆش کەوت و لە فەتحی مەککەو غەزای طائیف و خەیبەر و حونەیندا هیچ باسیکی نیە.

رایەك دەڵێت عەقیل پێش رێککەوتنی حودەیبیە موسڵمان بوو، بەڵام لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کرد.

رایەکیش دەڵێت عەقیل بە بێباوەڕی مایەوە تا لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، دواتر لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد و یەکێك بوو لەوانەی لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە.

برایەکی تری ناوی جەعفەر بوو کە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەرپرسی کۆچەرانی حەبەشە بوو، لە غەزای موئتەدا شەهید بوو و پێغەمبەری خوایش ﷺ موژدەی دا کە جەعفەر لە بەهەشتە.

عەلی زۆر جەعفەری خۆشدەویست، بۆیە عەبدوڵای کوری جەعفەر کە برازای عەلیە دەڵێت هەرکات داوای شتێکم لە عەلی بکردایەو نەیکردایە بموتایە لەبەر خاتری جەعفەر ئەوەم بدەرێ یەکسەر پێی دەدام.

## خوشکەکانی:

ئوممو هانیئی کچی ئەبوو طالیب کە لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، کاتێك موسڵمان بوو پەنای هوبەیرەی مێردی دا و پێغەمبەریش ﷺ پەناکەی قبووڵ کرد.

جومانەی کچی ئەبوو طالیب کە ئەم زووتر موسڵمان بووبوو، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لە دەستکەوتەکانی خەیبەر سی کۆڵ خورمای پێدا.

رەیطەی کچی ئەبووطالیب کە کونیەکەی ئەمموطالیبە، پێغەمبەر ﷺ لە دەستکەوتەکانی خەیبەر چل کۆڵ خورمای بۆ بڕیەوە.

## هاوسەرەکانی:

فاطیمەی کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا، کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ گەورەی ژنانی بەهەشت و دایکی دوو ڕەیحانە و خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ یەکەم کەسی ناو بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ بوو کە دوای پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب کاتێك کە فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺژنی بوو چووە داوای جوەیریەی کچی ئەبووجەهل، ئەوەبوو بەنوموغیرە هاتن داوای مۆڵەتیان کرد لە پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی نەدان و فەرمووی (فاطیمە بەشێکە لە من و ئەو شتەی ئەو ئازار دەدات منیش ئازار دەدات).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (سوێند بەخوا کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا لای یەك پیاو کۆ نابنەوە)، عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە ئەمەی بیست کشایەوە و نەیهێنا.

خەولەی کچی ئیاس هاوسەری عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و دایکی موحەممەدی کوڕی عەلیە، واتە باوەژنی حەسەن و حوسەینی کچەزاکانی پێغەمبەرە ﷺ.

دوای ئەوەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ئومامەی کچی زەینەبی بەهاوسەرگرت کە خوشکەزای فاطیمە بوو، ئەمەش لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکر صدیق و پاش جەنگی یەمامە بوو.

ژنێکی تری ناوی لەیلای کچی مەسعوود بوو کە دایکی عوبەیدوڵا و ئەبووبەکری کوڕانی عەلی بوو.

ژنێکی تری ناوی ئومولبەنینی کچی حیزامە کە دایکی عەبباس و عوثمان و عەبدوڵا و جەعفەر بوو.

## منداڵەکانی:

ئەوانەی لە فاطیمە بوون:

حەسەن کە لە ساڵی سێیەمی کۆچی لەدایك بوو و گەورەی گەنجانی بەهەشت و ڕەیحانەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

حوسەین کە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ و برا بچووکی حەسەن و گەورەی گەنجانی بەهەشتە، لە ساڵی شەست و یەکی کۆچی لە کەربەلا بە دەستی سەربازانی دەوڵەتەکەی یەزید شەهید کرا.

کوڕێکی تری هەبوو بە ناوی موحسین کە برا بچووکی حوسەین بوو، کاتێك لەدایك بوو پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو کوڕەکەمم نیشان بدەن بزانم ناوتان ناوە چی؟ وتی ناومان ناوە حەرب، فەرمووی (بەڵکو موحسینە).

کچێکی هەبوو بە ناوی ئوممو کلثوم کە لە ساڵی شەشی کۆچی لەدایك بوو.

کچێکی تری هەبوو بە ناوی زەینەب کە ئەمیش کچەزای پێغەمبەر ﷺ بوو، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەدایك بوو، زەینەب لەگەڵ حوسەینی برایدا چوو بۆ کەربەلا، کاتێك حوسەینی برای شەهید کرا، زەینەب-هاودەم بەو ژن و منداڵانەی کە مابوون- برا بۆ دیمەشق.

کوڕێکی تری هەبوو کە ناوی موحەممەد بوو و لە مێژوودا بە ئیبنولحەنەفیە ناسراوە، دایکی ناوی خەولەیە.

عوبەیدوڵای کوڕی کە دواتر بە دەستی موختاری کوڕی ئەبی عوبەید کوژرا، ئەبووبەکری کوڕی کە لەگەڵ حوسەینی براگەورەیدا شەهید بوو، دایکی ئەم دوانە لەیلای کچی مەسعوود بوو.

عەبباس و عوثمان و جەعفەر و عەبدوڵا کە هەموویان لەگەڵ حوسەینی برا گەورەیاندا شەهید بوون، دایکیان ناوی ئوممولبەنینی کچی حیزامە.

موحەممەدی بچووك كە دایكی ئومموولەد بوو، یەحیا و عەونیش دو كوڕی تری بوون كە دایكیان ناوی ئەسمائی كچی عومەیس بوو، عومەر و روقییە كە دایكیان ناوی ئوممو حەبیبی كچی رەبیعە بوو و كەنیزەكی عەلی بوو، موحەممەدی دووەم كە دایكی ناوی ئومامەی كچی ئەبیلعاص بوو، ئوممولحەسەن و رەملە كە دایكیان ناوی ئوممو سەعیدی كچی عوروە بوو، ئوممو هانی و مەیمونەو زەینەبی بچوك و رەملەی بچووك و ئوممو كلپوومی بچووك و فاطیمەو ئومامەو خەدیجەو ئوممولكیرام و ئوممو سەلەمەو ئوممو جەعفەر و جومانەو نەفیسە كە لە خێزانەكانی تری هەیبوون.

## موسڵمانبوونی

ئەبووطالیب لەبەرئەوەی تووشی تەنگژەیەکی دارایی بووبوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێشنیازی کرد بۆ عەبباسی مامی تا پێکەوە باری سەرشانی ئەبووطالیب سووك بکەن، ئەوەبوو چوون و هەرکامیان یەکێك لە منداڵەکانی ئەبووطالیبیان بردە لای خۆیان تا سەرپەرشتییان بکەن، عەلی کەوتە بەر پێغەمبەر ﷺ و لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ مایەوە.

عەلی پێش موسڵمانبوونی هیچ کات بتی نەپەرستبوو، چونکە تەمەنی کەم بوو و نەگەیشتبووە ئەو بارەی بت بپەرستێت، ئەو لە تەمەنی نۆساڵیدا موسڵمان بوو.

کاتێك خەدیجە باوەڕی هێنابوو، عەلی هات بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ و بینی نوێژ دەکەن، وتی ئەی موحەممەد ئەمە چیە؟ ئەویش فەرمووی (ئەمە ئاییني خوایە کە خوا هەڵیبژاردووەو پێغەمبەری خۆی پێدا ناردووە، جا بانگت دەکەم بۆ لای خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ و پەرستشی ئەو خوایە و

بێباوەڕبوونت بە لات و عوززا، عەلی وتی من تا ئێستا شتی وام نەبیستوە، هیچ ناڵێم تا باسی نەکەم بۆ ئەبووطالیب، پێغەمبەر ﷺ حەزی نەکرد باسی بکات بۆ ئەبوطالیب و پێی فەرموو (ئەی عەلی ئەگەر موسڵمان نابیت ئەوە مەسەلەکە بە شارەوەیی بهێڵەرەوە)، ئەوەبوو ئەو شەوە عەلی مەسەلەکەی بە نهێنی شاردەوەو دواتر خوا ئیمانی خستە دڵیەوەو بۆ بەیانی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی ئەی موحەممەد پێشنیازی موسڵمان بوونت بۆم چیە؟ ئەویش فەرمووی (شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوای تەنهای بێ هاوەڵ و بێباوەڕ بیت بە لات و عوززا و تەبەرا بکەیت لە هاوەڵدانراوان بۆ خوا)، عەلیش ئەوەی کرد و موسڵمان بوو، بەڵام موسڵمان بوونی خۆی دەشاردەوە لە باوکی و بە نهێنی دەهات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ماوەی مانگێك بارەکە بەو جۆرە بوو.

ئیبن کەثیر سەبارەت بە ریزبەندی دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان دەڵێت: دەکرێت لە کۆی هەموو گێڕانەوەکانەوە بڵێین یەکەم ئافرەت موسڵمان بوو خەدیجە بوو، یەکەم منداڵ موسڵمان بوو عەلی بوو، یەکەم خزمەتکار موسڵمان بوو زەیدی کوڕی حارثە بوو، یەکەم پیاو موسڵمان بوو ئەبووبەکری صدیق بوو.

## رۆڵی لە مەککەدا:

عەلی هۆکار بوو بۆ موسڵمانبوونی کەسانێکی دیار، لەوانە ئەبووذەری غیفاری، گێڕانەوەیەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە وردەکاری موسڵمانبوونەکەی ئەبووذەر دەخاتەڕوو، تیایدا هاتووە ئەبووذەر بارگەی پێچایەوەو ئاوی هەڵگرت و چوو تا گەیشتە مەککەو چوو بۆ لای کەعبە و بەدوای پێغەمبەردا ﷺ دەگەڕا و ئەویشی نەدەناسی، حەزیشی نەدەکرد لای خەڵك هەواڵی بپرسێت، بۆیە بەو حاڵەوە مایەوە تا نزیکەی شەو، ئینجا راکشا، عەلی کە ئەوی بینی زانی کەسێکی

بێگانەیە، کاتێك بینی شوێنی کەوت و هیچکام پرسیاریان لەهیچکام نەکرد تا بەیانی، دواتر ئەبووذەر لە ماڵی عەلیەوە توێشووەکەی هەڵگرتەوەو چوویەوە بۆ لای کەعبە و سێ رۆژ ئەم شتە دووبارە بوویەوە، لە رۆژی سێیەمدا عەلی کە بردیەوە لەگەڵ خۆی پرسیاری لێکرد ئەرێ پێم ناڵێیت بۆچی هاتویت بۆ ئێرە؟ ئەویش وتی ئەگەر بەڵێنم پێ بدەیت رێنموونیم بکەیت پێت دەڵێم، ئەویش بەڵێنی دا، ئەبووذەریش پێی وت بۆچی هاتووە، عەلیش وتی ئەو پێغەمبەرە راست دەکات، کە رۆژ بوویەوە شوێنم بکەوە، ئەگەر من شتێکی مەترسیدارم بینی واهەڵدەستم وەك ئەوەی ئاو بڕژم، ئەگەریش بەردەوام چووم شوێنم بکەوە تا دەتبەم بۆ لای، ئەوەبوو بەیانی ئەبووذەر شوێنی کەوت تا چوویە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوێی لێگرت و هەر لەوێ موسڵمان بوو.

هاوکات عەلی هاودەم بە پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکری صدیق دەچوو تا پغەمبەر ﷺ پەیامەکەی بخاتەڕوو بۆ هۆزەکان، جا جارێك چووین و ئەبووبەکر پێشکەوت، هەواڵی پرسین، وتیان ئێمە لە ڕەبیعەین، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پەیامی خۆی گەیاند پێیان.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، عەلی کوڕی ئەبووطالیبی بانگ کرد و فەرمانی پێکرد لە شوێنەکەیدا بخەوێت و لە مەککە بمێنێتەوە تا سپاردەکانی لای پێغەمبەر ﷺ بداتەوە دەست خاوەنەکانیان، عەلیش فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ بێ هیچ ترسێك بەجێگەیاند و ماوەی سێ شەو و ڕۆژ لە مەککە مایەوە تا هەموو سپاردەکانی دایەوە بە خاوەنەکانی، دواتر کۆچی کرد و خۆی گەیاندە مەدینە، لە مەدینە لای کلثومی کوڕی هەدم دابەزی.

## کۆچکردنی

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و سەهلی کوڕی حونەیفەوە.
پێغەمبەری خوا ﷺ کە چوو بۆ غەزای (ذي العشيرة) عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش هاودەم بە پێغەمبەر ﷺ بەشداری کرد.

## بەشداری لە غەزای بەدردا

پێغەمبەر ﷺ کە ویستی بچێت بۆ بەدر عەلی کوڕی ئەبووطالیب و زوبەیری کوڕی عەووام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی هاودەم بە چەند هاوەڵێك نارد تا بچنە لای ئاوی بەدر و هەواڵ و زانیاری بۆ وەربگرن.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەڵێت لە غەزای بەدردا عەریشێکمان –چادر یان کەپرێ- بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کرد، وتمان کێ لەلا پێغەمبەر ﷺ دەبێت بۆ ئەوەی کەس نزیکی نەکەوێت، کەس نەچوو، تەنها ئەبووبەکر نەبێت کە شمشێری هەڵکرد و لەلای پێغەمبەرەوە ﷺ وەستاو پاسەوانی دەکرد.

سەرەتای جەنگەکە جەنگی زۆرانبازی بوو، واتە کەسێك بەرامبەر بە کەسێك، ئەوەبوو شەیبەو عوتبەی کوڕانی رەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبە لە بێباوەڕان هاتنە پێشەوەو داوای جەنگی بەرامبەرییان کرد، ئەوەبوو سێ لە هاوەڵانی پشتیوانان هاتنە پێشەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ حەزی نەدەکرد لە جەنگی یەکەمدا پشتیوانان لە پێشەوە بن، بۆیە داوای کرد بگەڕێنەوەو نزای خێری کرد بۆیان، قورەیشیەکان وتیان ئەی موحەممەد کەسانی شیاو لە خزمانمان بنێرە بۆمان، ئەوەبوو پێغەمبەریش ﷺ داوای کرد لە کۆچەران تا بچنە پێشەوە، حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب و عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و

عوبەیدەی کوڕی حارث چوونە پێشەوە، عوتبە وتی قسە بکەن تا بتانناسینەوە، حەمزە وتی من حەمزەی کوڕی عەبدولموطە لیبم، شێری خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ، عوتبەش وتی هاوبەرامبەرێکی چاك و رێزدار، منیش شێری هاوپەیمانانم، ئەی ئەو دوانە کێن لەگەڵت؟ ئەویش وتی عەلی و عوبەیدە، هەمان وەسفی ئەوانیشی کرد، ئینجا بە وەلیدی کوڕی وت هەستە، بەرامبەر بە عەلی وەستا، جەنگان و هێندەی نەبرد عەل وەلیدی کوشت، ئینجا حەمزە عوتبەی کوشت، ئینجا شەیبە بەرامبەر بە عوبەیدە وەستا، عوبەیدەش بە تەمەنترینی هاوەڵانی ئەو جەنگە بوو، شەیبە دای لە پێی عوبەیدەو قاچی بڕی، خێرا حەمزە و عەلی چوون بۆ شەیبەو کوشتیان.

عەلی باسی گەرمەی جەنگەکە دەکات و دەڵێت برێ جەنگم کرد و هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەبینم لە سوجدەدایەو دەفەرمووێت (یا حی یا قیوم یا حی یا قیوم) منیش گەڕامەوە بۆ جەنگەکە، هەمدی هاتمەوەو بینیم لە هەمان باردایە، بۆ جاریَ سێەمیش جەنگەکەم جێهێشت و هاتمەوە خزمەتی لە هەمان باردا بوو.

لە کاتی گەڕانەوەدا پێغەمبەر ﷺ و ئەبولوبابەو عەلی کوڕی ئەبوطالیب پێکەوە بوون و یەك سواریان پێ بوو، ئەوان دەیانوت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بری ئێمە سەرکەوە، بەڵام پێغەمبەر دەیفەرموو (ما أنتما بأقوى على المشي مني، ولا أنا أغنى عن الأجر منكما) (ئێوە لە من لە رێ بریندا بەهێزتر نین و منیش لە ئێوە بێباکتر نیم بە پاداشت).

## هاوسەرگیری عەلی و فاطیمە

عەلی کوڕی ئەبوطالیب دەڵێت خزمەتکارێکم وتی دەزانیت فاطیمە داواکراوە؟ وتم نا، وتی با، ئەی بۆ تۆ ناچیتە داوای؟ منیش وتم خۆ هیچم نیە تا بچمە داوای، ئەویش وتی ئەگەر بچیت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فاطیمەت پێ دەدات، هێندەی پێ وتم تا منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە چوومە ئەوێ و لەبەردەمیدا دانیشتم نەمتوانی هیچ بڵێم، فەرمووی بۆچی هاتویت؟ ئیشێکت هەیە؟ منیش بێدەنگ بووم، هەمدی لێی دووبارە کردمەوە و بێدەنگ بووم، ئەویش فەرمووی (لەوانەیە هاتبیت بۆ داوای فاطیمە؟) وتم بەڵێ، فەرمووی ئەی هیچت هەیە بۆمارەییەکەی؟ وتم نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەی چیت کرد بە قەڵغانەکەت کە پێم دایت، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو قەڵغانە زۆر قورس و پتەو بوو، منیش وتم لای خۆمە، فەرمووی (دەی لێم مارە کردیت، ئەو قەڵغانەی بۆ بنێرە تا بەوە حەلاڵ بێت بۆت).

کاتێك عەلی ویستی هاوسەرگیری لەگەڵ فاطیمە بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هیچت هەیە؟ عەلی وتی هیچم نیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی قەڵغانە قورسەکەت کوا؟ وتم لای خۆمە، ئەوەبوو ئەو قەڵغانەی دا بە فاتیمە.

کاتێك عەلی کوڕی ئەبوطالیب فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوای ﷺ بە هاوسەر گرت، بۆ ماڵێك دەگەڕا تا تیایدا نیشتەجێ بێت، بەڵام خانوویەکی دوور لە ماڵی پێغەمبەری خوای ﷺ دەست کەوت و لەوێ گواستیەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵیان و پێی فەرموون دەیەوێت نزیکیان بکاتەوە لە ماڵی خۆی، فاطیمەش وتی داوا لە حارثە بکە تا شوێنەکەی بگۆڕێتەوە لەگەڵمان تا نزیك بینەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (حارثە هێندە شوێنی خۆی بۆ چۆڵکردوین ئیتر رووم نایەت پێی بڵێم)، حارثە ئەوەی بیستەوەو و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە دەتەوێت فاطیمە لێتەوە نزیك بێت و ئەوەش خانووەکانی منن، من خۆم

و ئەوەشی هەمە بۆ خوا و پێغەمبەری خوایە، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی تۆ لێم وەردەگریت لام زۆر خۆشترە لەوەی وازی لێ دێنیت بۆم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (راست دەکەیت، خوا بەرەکەت بڕژێت بەسەرتدا)، ئەوەبوو فاطیمە هاتە ناو خانوویەکی حارثە کە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بوو، حارثە لە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ چەند خانوویەکی هەبوو، هەر جارەو یەکێك لەو خانووانەی چۆڵ دەکرد بۆ خۆشەویستێکی پێغەمبەر ﷺ تا هەموو خانووەکانی ئەو شوێنەی دا بە پێغەمبەر ﷺ و هاوسەرەکانی.

## لە غەزای ئوحوددا

لە غەزای ئوحوددا پێغەمبەر ﷺ ئاڵایەکی دابوویە دەست عەلی کوڕی ئەبووطالیب، بەڵام دواتر ئاڵاکەی لەو وەرگرت و دای بە موصعەبی کوڕی عومەیر و عەلیش بەشداری جەنگەکەی کرد.

لە غەزای ئوحوددا حاطیب دەنگێکی بیست هاواری دەکرد موحەممەد کوژرا، حاطیب تەواو شڵەژا و گەڕا بەدوای پێغەمبەردا ﷺ تا بینی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی طالیبدایەو بریندار بووەو دەموچاوی دەشوات.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوویە چاڵەکەوە، عەلی دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ گرت و طەلحەش بەرزی دەکردەوە.

دواتر کە جەنگەکە تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ عەلی نارد تا بزانێت قورەیشیەکان نیازیان هەیە رووەو مەدینە بچن یان بگەڕێنەوە بەرەو مەککە، ئەویش چوو و هەواڵی هێنایەوە کە بەرەو مەککە دەگەڕێنەوە.

لە غەزای بەدری داهاتوودا کە وادەی پێغەمبەر ﷺ بوو لەگەڵ قورەیش لە ساڵی داهاتوو لە هەمان بەرواری ئوحوددا لە بەدر بەیەك بگەن، عەلی کوڕی ئەبوطالیب بەشدار بوو و ئاڵآی موسڵمانانی بەدەستەوە بوو.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بیست کە فاتیمەی کچی منداڵی بووە خێرا چوو بۆ ماڵیان، فەرمووی (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی کوڕەکەمم نیشان بدەن، ناوی چیتان لێ ناوە؟) عەلی کوڕی ئەبوو طالیبیش وتی ناوم ناوە حەرب، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بل هو حسن)، (بەڵکو با ناوی حەسەن بێت)، بەوە ناوی نرا حەسەن.

## لە غەزای خەندەقدا

هەروەها عەلی لە غەزای خەندەقیشدا بەشداری کرد و ڕۆڵی کارای بینی، جا کاتێك بێباوەڕان کەلەبەرێکیان بەدیکرد و چەند کەسێکیان پەڕینەوە، یەکێك لەوانە عەمری کوڕی عەبدود بوو، عەمر وتی کێ بەرامبەرم دەوەستێت و دەجەنگێت؟ عەلی چوویە بەرامبەری، عەمر وتی برازا من حەز ناکەم بتکوژم، عەلی وتی جا من تۆ بانگ دەکەم بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیسلام، عەمر وتی هیچ پێویستیم بەوانە نیە، عەلی وتی دەی بانگهێشتی جەنگت دەکەم، ئەوەبوو جەنگان تا جەنگێکی قورسیان کرد و تیایدا عەلی عەمری کوشت.

لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی ئامادە کرد بۆ ناوچەی فەدەك، ئەمەش لە مانگی شەعباندا بوو، عەلی کوڕی ئەبووطالیبی کرد بە ئەمیری سریەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەد کەسی لەگەڵدا نارد و هێرشیان برد و دەستکەوتێکی زۆریان بەدەستهێنا و گەڕانەوە.

## ڕووداوی ئیفك

لە ڕووداوی ئیفکدا کە تیایدا دووڕوان بوختانیان دروستکرد بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە و دواتر خوا بە دەقی ئایەت پاکی عائیشەی سەلماند و دووڕوویی دوروەکان دەرکەوت، لەو ماوەدا پێغەمبەر ﷺ ئوسامەی کوڕی زەید و عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی بانگکرد تا ڕاوێژیان پێ بکات سەبارەت بە جیایی و دوورکەوتنەوەی لە عائیشە، ئوسامە شایەتی پاکی بۆ دا و وتی تەنها خێر و چاکەمان لێ دیوە، عەلیش پێی وت خوا بارت سەخت ناکات و ئافرەتی تر جگە لەو زۆرن، دەشتوانیت خزمەتکارەکە بانگ بکەیت تا ڕاستیەکەت بۆ دڵنیا بکاتەوە، پێغەمبەریش ﷺ بورەیرەی بانگ کرد و لێی پرسی ئەی بورەیرە هیچت دیوە کە گومانت لا دروست بکات، وتی نا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە...هتد.

جا ناحەزانێك کە تەنیا رووی لێدانی مێژووی ئیسلامی و هاوەڵانیان لەبەرچاوە، وا قسەکە لێکدەدەنەوە ە ئەوە ریشەیەکی دژایەتی نێوان عەلی و عائیشە بێت، لەکاتێکدا ئەوە ئیجتیهادێکی عەلی بوو لە مەسەلەکەدا و هیچی تر، ئەگەرنا دەیان وەسفی عائیشە لەلایەن عەلی و بە پێچەوانەوە لە فەرموودەکاندا بەدی دەکەین کە وەڵامی ئەو گومانە دەدەنەوەو لێرەدا لەبەر درێژنەکردنەوەی نووسینەکە نایانخەینەڕوو.

هەروەها عەلی لە غەزای بەنوقورەیضەدا بەشداری کردو ئاڵایەکی بەدەستەوە بوو.

## لە ڕێککەوتنی حودەیبییەدا

کاتێك پێغەمبەر ﷺ بە مەبەستی عومرە چوو بەرەو مەککەو قوڕەیشیەکان ڕێیان پێگرت، دواجار بڕیاری ڕێککەوتنیان دا و پاش چەند دانووستانێك، دواجار لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمر ڕێککەوتن، عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەقی ڕێککەوتنەکەی دەنووسیەوە.

کاتێك عەلی نووسی موحەممەدی پێغەمبەری خوا، بێباوەڕەکان وتیان مەنووسە موحەممەدی پێغەمبەری خوا، ئەگەر تۆ پێغەمبەر بوویتایە لەگەڵت نەدەجەنگاین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بیسڕەوە، عەلی وتی من نایسڕمەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ خۆی سڕیەوە.

## لە غەزای خەیبەردا

ڕۆڵی کارای عەلی کوڕی ئەبووطالیب لە غەزای خەیبەردا بەرچاو دەکەوێت، کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئاڵآی سوپاکەی دایە دەست عەلی و خوای گەورە فەتحی بەخشی بە موسڵمانان.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ فەتحی خەیبەر، عەلی لەبەر ئازارێ کە لە چاویدا هەبوو نەچوو، دوایی خۆی پێ ڕانەگیرا و وتی چۆن لە پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوم؟ بۆیە بەو ئازاری چاوەوە خۆی گەیاند بە پێغەمبەر ﷺ.

کاتێك فەتحی خەیبەر سەختی تێکەوت، بۆ شەوەکەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (لأعطين الراية غدا رجلا يفتح على يديه، يحب الله ورسوله، ويحبه الله ورسوله)، (سبەینێ ئاڵآکە دەدەمە دەست کەسێك کە خوا لەسەر دەستی ئەو فەتحی خەیبەر دەبەخشێت، ئەو کەسە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت و خوا و پێغەمبەری خواش ﷺ ئەویان خۆش دەوێت)،

هەموو هاوەڵان هیوایان وابوو ئەوان بن، بۆ بەیانی پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی عەلی لە کوێیە؟ وتیان ئازاری چاوی هەیە، پێغەمبەر ﷺ تفی دا لە چاوانی عەلی و نزای خێری بۆ کرد و چاك بوویەوە، ئینجا ئاڵاکەی دایە دەستی، ئینجا پێی فەرموو (لەسەرخۆ هەنگاو بنێ تا دەچیتە لایان، دواتر بانگیان بکە بۆ ئیسلام و پێیان بڵێ چییان لەسەر پێویستە، جا بەخوا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە کەسێك رێنموونی بکات زۆر بۆت باشترە لە کۆمەڵە وشتری سوور).

گێڕانەوەیەکی شیعەکان هاتووە کە پێشتر پێغەمبەر ﷺ ئەبووبەکری ناردبوو کەچی لەسەر دەستی ئەو فەتح نەکرا، دواتر عومەری نارد و لەسەر دەستی ئەویش فەتح نەکرا، دواتر ئاڵاکەی دایە دەست عەلی، ئەوەبوو خوا لەسەر دەستی ئەو فەتحی خەیبەری بەخشی، بەڵام ئەو کەسەی گێڕاویەتەوە بەوە ناسراوە کە کەسێکی شیعەیە، جا شیعەکان بۆ پێشخستنی عەلی لە هەر هەنگاوێ کەمتەرخەمی ناکەن، چ جای پێدانی زیادە بە دەقە مێژووییەکان.

## لە فەتحی مەککەدا:

کاتێك قورەیشیەکان پەیمانیان شکاند و پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا هێرش بباتە سەر مەککە و فەتحی بکات، ئەبووسوفیان هات تا ڕێککەوتنەکە درێژ بکاتەوە، کە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدایەوە، بۆیە چوو تکای لە ئەبووبەکر و عومەر و عەلی کرد تا لای پێغەمبەر ﷺ سکالآی بۆ بکەن، ئەوەبوو کە چوو بۆ لای عەلی حەسەنی کوڕی عەلی منداڵێك بوو لەبەردەمیدا یاری ئەکرد، عەلیش وەك ئەوانی تر ئەبووسوفیانی بێهیوا کرد و وتی پێغەمبەر ﷺ بڕیارێکی داوە کە کەسمان بۆی نیە قسەی تێدا بکات.

کاتێك حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە بە نهێنی نامەیەکی نووسی بۆ مەککە تا هەواڵی هێرشی پێغەمبەریان ﷺ پێ بدات، خوای گەورە ئەوەی ئاشکرا کرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و زوبەیر و میقدادی کوڕی ئەسوەدی نارد بە شوێن ئەو ژنەی نامەکەی بردووەو

ئەوانیش ژنەکەیان گرت و نامەکەیان لێ سەندەوەو گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ .

پاش ئەوەی خالید بە هەڵە کوشتارێکی کرد، پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی بانگ کرد و رایسپارد تا خوێن بایی تەواوی ئەو هۆزە بدات و هەموو بارێکی سەردەمی نەفامی بخاتە ژێر پێی، عەلی چوو بۆ ئەوێ و هەرچی خوێن باییەك هەبوو پێی دانەوە، دواتر چی زیانی دارایی هەبوو هەمووی بۆ قەرەبوو کردنەوە، تەنانەت ئەگەر قاپی بەردەم سەگەکانیش شکابوایە ئەوەشی بۆ قەرەبوو دەکردنەوە، دواتر کە تەواو بوو بڕێك سامان مایەوە، عەلی وتی ئەو زیادەش بۆ ئێوە با ئەگەر شتێك ئێمە نەیزانین و ئێوە بیزانن بەوە قەرەبوو بێتەوە، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵی پێدا کە چی کردووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (چاکت کردو پێکات).

عەلی کوڕی ئەبووطالیب لە غەزای حونەینیشدا بەشداری کرد و یەکێك لە ئالآکانی کۆچەرانی بەدەستەوە بوو،[٢٢] هاوکات

لە غەزاکەدا کاتێك موسڵمانان شکان و لە دەوری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بلاّوەیان کرد، عەلی یەکێك بوو لەوانەی لە دەوری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مایەوەو بەرگری لێکرد.[٢٣]

لە مانگی رەبیعولئاخیری ساڵی نۆیەمی کۆچیدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سریەیەکی بە سەرکردایەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب نارد بۆ لەناوبردنی بتی طهی ْ و سەد کەس لە پشتیوانانی لەگەڵ نارد و ئالآیەکی رەش و ئالآیەکی سپیشی دایە دەستی، ئەوانیش چوون و ئەرکەکەیان بەجێگەیاند و بە بڕێك دەستکەوتەوە گەڕانەوە.[٢٤]

هەر لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا کە ئەبووبەکری صدیق حەجی بۆ خەڵکەکە کرد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەلی بە سواری وشترەکەی خۆی نارد، کە عەلی گەیشت بە ئەبووبەکر، وتی عەلی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تۆی کردووە بە بەرپرسی حەجەکە؟ عەلی وتی نا، بەڵکو منی ناردووە تا

پەیامی پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکەکە بخوێنمەوە، ئەوەبوو ئەبووبەکر بە پێشەنگی حەجەکە مایەوەو عەلیش تیایدا بەشدار بوو و پەیامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ خوێندەوە.

## لە غەزای تەبووکدا

عەلی لە غەزای تەبووکدا بەشداری نەکرد، ئەمە ش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئیبن کەثیر سەبارەت بەو کەسانەی کە نەچون بۆ غەزای تەبووك دەڵێت: ئەوانەی نەچوون بۆ غەزای تەبووك چوار بەش بوون، بەشێك فەرمانیان پێکرابوو لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ تا نەچن و پاداشتیان بۆ هەیە وەك عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئیبن ئوم کلثوم، دەستەیەکی تر بیانوویان هەبوو لەبەرئەوەی لە لاوازان و نەخۆشان بوون، دەستەیەکیش ئەوانە بوون کە لە خەفەتی نەچوونەکەیان دەگریان، تاوانبارەکان بوون کە ئەبوولوبابەو

هاوەڵەکانی بوون، دەستەی چوارەمیش سەرکۆنەکراوان بوون کە بریتی بوون لە دووڕووەکان.

پێغەمبەر ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ یەمەن تا بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، بەڵام ئەوان نەهاتن بە دەم بانگەوازەکەوە، شەش مانگ بەو جۆرە لە هەوڵدا بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی نارد و فەرمانی کرد خالید بگەڕێتەوەو هەرچیەك لە سوپاکەی خالیدیش ویستی بمێنێتەوە ئەوە با بمێنێتەوە، ئەم چوونەی عەلیش لە ساڵی دەیەمی کۆچیدا بوو.

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی نارد بۆ لای خالید تا پێنج یەکی دەستکەوتەکان وەربگرێت، وەك لە فەرموودەی صەحیحی بوخاریدا هاتووەو وا لە خوارەوە ئاماژەی پێدەدەین:

بورەیدە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید تا پێنج یەکی دەستکەوت دابەش بکات.

بورەیدە دەڵێت پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید تا پێنج یەکی دەستکەوت دابەش بکات، کە بەیانی بوویەوە عەلی ئاو لەسەری دەچۆڕا، خالید بە بورەیدەی وت دەبینیت (عەلی) چی دەکات یان دەبینیت چی کردووە؟ بورەیدە دەڵێت منیش رقم بوو لە عەلی، کاتێك گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵم پێدا عەلی چی کردووە، ئەویش فەرمووی ئەی بورەیدە ئایا تۆ رقتە لە عەلی؟ وتم بەڵێ، فەرمووی رقت لێی نەبێت.

لە گێڕانەوەکەی ئیمامی بوخاریدا وا هاتووە کە بورەیدە بە خالیدی وت نابینیت چی کردووە؟ جا کە گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی ئەی بورەیدە

ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم بەڵێ، فەرمووی رقت نەبێت لێی چونکە لە پێنج یەکدا بەشی لەوە زیاتریشی بۆ هەیە)

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بورەیدە دەڵێت هێندە رقم لە عەلی بوو کەسی تر نەبوو هێندە رقم لێی بێت، تەنانەت پیاوێك هەبوو لە مەککە بەس لەبەرئەوە خۆشم دەویست کە رقی بوو لە عەلی، جا لە سوپایەکدا هاودەمی ئەو پیاوەم کرد بەس تەنها لەبەرئەوەی کە رقی بوو لە عەلی، ئەوەبوو برێ دەستکەوتمان دەستکەوت، ئەو کەسە هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ کەسێك بنێرە تا پێنج یەکەکەی دابەش بکات، پێغەمبەریش ﷺ عەلی نارد، لە دیلە ئافرەتیەکاندا ئافرەتێك هەبوو کە لە هەموویان جوانتر بوو، عەلی ئەوەی لە پێنج یەکەکە دانا و دابەشی کرد، دواتر هاتەدەر و سەری ئاوی لێدەچۆڕا، وتمان ئەی ئەبولحەسەن ئەوە چیە؟ وتی وەصیفە (ئافرەتەکە) نابینن کە لە کەنیزەکەکان بوو، من دابەشم کرد و بەر پێنج یەکەکە کەوت، دواتر بوو بە بەشی ئالوبەیتی پێغەمبەر ﷺ و دواتر بوو بە

بەشی بنەماڵەی عەلی و منیش چوومە لای، پیاوە سەرکردەکە نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ و منیش وتم من وەك نێردراو و پشت راست بنێرە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە نامەکەم دەخوێندەوەو دەموت راستی نووسیوە، پێغەمبەریش ﷺ دەستی گرتم و نامەکەشی گرتە دەستی و فەرمووی ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم بەڵێ، فەرمووی (دەی رقت لێی نەبێت، ئەگەریش خۆشت دەوێت زیاتر خۆشت بوێت، دە سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە پشکی بنەماڵەی عەلی لە پێنج یەکدا باشتر و زیاترە لە وەصیفە)، بورەیدە دەڵێت سوێند بەخوا دوای ئەو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کەس نەبوو هێندەی عەلی لام خۆشەویست بێت.

سەبارەت بە رقبوونی خالید لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب کە لەم فەرموودەدا هاتووە مەبەست پێی دژایەتی نەبووە، چونکە دەبینین خالید دەستبەجێ دابەش کردنەکە دەداتە دەست عەلی و هیچ دەستوەردانێکیشی نابێت، بەڵام دەشێت رق و بێزاریەك

له دەروونیدا بووبێت بەرامبەر بە عەلی و هۆکارێك بووبێت، ئایا هۆکارەکە هەرچی بووبێت رەوا نەبووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە بورەیدە(دەی رقت نەبێت لە عەلی) پێشدەچێت خالیدیش ئەوەی لە بورەیدە بیستبێتەوەو ئەو دڵ خەوش گرتنەی بەرامبەری نەمابێت، چونکە ئیتر نابینین هیچ هەڵوێستێکی بێزاری خالید بەرامبەر بە عەلی دوای ئەوە بوونی بووبێت.

## پلەوپایەی عەلی

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا کە باس لە فەزڵی هاوەڵانێکی دەکات دەفەرموێت: (أرحم أمتي بها ابو بكر وأقواهم في دين الله عمر وأصدقهم حياء عثمان وأقضاهم على بن أبي طالب وأفرضهم زيد وأقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح وأبو هريرة وعاء) (بە رەحمترینی ئوممەتم بە ئوممەتەکەم ئەبوبەکرەو بەهێزترینیان لە ئایینی خوادا عومەرەو بە شەرمترینیان عوثمانە و دادوەرترینیان عەلی کوری ئەبووطالیبەو شارەزاترینیان بە فەرزەکان زەیدە و شارەزاترینیان بە قورئان خوێندنەوە ئوبەی کوڕی کەعبە و شارەزاترینیان بە حەڵاڵ و حەرام موعازی کوڕی جەبەلەو ئەمینداری ئەم ئوممەتەش ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراحە و ئەبوو هورەیرەش قاپ و جامێکە).

عەلی کوڕی ئەبووطالیب یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة في الجنة والزبير في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة، وسعد في الجنة، وسعيد في الجنة، وأبو عبيدة بن الجراح في الجنة)، (ئەبووبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوثمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، طهلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، سەعید لە بەهەشتە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح لە بەهەشتە).

جارێك موغیرە لای سەعیدی کوڕی زەید قسەی بەرامبەر بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کرد، سەعید هەستاو وتی من شایەتی دەدەم بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (عشرة في الجنة: النبي في الجنة، وأبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة بن عبيد الله في

الجنة، والزبير بن العوام في الجنة، وسعد بن مالك في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة)، (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتدایە، ئەبووبەکر لە بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، عوثمان لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە بەهەشتدایە، زوبەیری کوڕی عەووام لە بەهەشتدایە، سەعدی کوڕی مالیك لە بەهەشتدایە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتدایە)، ئینجا زەید وتی بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان کێیە؟ بێدەنگ بو، دواتر زۆریان لێکرد تا بیڵێت، ئەویش وتی سەعیدی کوڕی زەید-واتە خۆی-.

جارێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر کێوی حیرا وەستابوو، کێوەکە لەریەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئارام بگرە حیرا، چونکە ئەوەی بەسەرتەوەیە یان پێغەمبەرە یان صدیقە یان شەهیدە)، ئەو دەمەش هەریەك لە پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر و عومەر

و عوثمان و عەلی و طەلحەو زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەسەر کێوەکە بوون.

زەیدی کوڕی ئەبی ئەوفا دەڵێت چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەیفەرموو فلآنە کەس لە کوێیە؟ بەردەوام هەواڵی یەکەیەکەیانی دەپرسی و دەینارد بە شوێنیاندا تا هەموویان هاتن و کۆبوونەوە، ئینجا فەرمووی: (إني أحدثكم بحديث فاحفظوه وعوه وحدثوا به من بعدكم، إن الله عز وجل اصطفى من خلقه خلقا، ثم تلا هذه الآية الله يصطفي من الملائكة رسلا ومن الناس خلقا يدخلهم الجنة، وإني مصطف منكم من أحب أن أصطفيه ومواخي بينكما كما آخى الله عز وجل بين الملائكة عليهم السلام)، (من قسەیەکتان بۆ دەکەم جوان وەریبگرن و لەبیرتان بمێنێت و لێی تێبگەن و بیگەیەنن بەوانەی دوای خۆتان، خوای گەورە لە دروستکراوەکانی دەستەیەکی هەڵبژاردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (الله يصطفي من الملائكة رسلا و من الناس)، منیش لەنێوتاندا ئەوانە هەڵدەبژێرم

کە حەز دەکەم هەڵیبژێرم، برایەتی دەخەمە نێوانتانەوە وەك چۆن خوای گەورە برایەتی خستە نێوان فریشتەکانەوە)، پاشان هەریەك لە ئەبووبەکر و عومەری بەدوای یەکدا بانگ کرد و تایبەتمەندی هەرکامیانی فەرموو و ئەوانی کرد بە برای یەکدی، عوثمانی کوڕی عەففانی بانگ کرد و پێی راگەیاند کە تووشی چ نارەحەتیەك دەبێت، پاشان عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد و باسی بەخشندەییەکەی عەبدوڕەحمانی کرد، پاشان طەلحەو زوبەیری بانگ کرد و هەردووکیانی کرد بە برای یەکدی، پاشان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەمماری کوڕی یاسری بانگ کرد و هەردووکیانی کرد بە برای یەکدی، پاشان عوەیمیر و سەلمانی فارسی بانگ کرد و ئەوانیشی کرد بە برای یەکدی، دواتر موژدەی حەوزی کەوسەری دا بە هاوەڵانی...

عەلی کوڕی ئەبووطالیب هەستا و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گیانم دەرچوو و پشتم شکا کاتێك دەبینم لەگەڵ هاوەڵانت وات فەرموو من نەبێت کە هیچت پێ نەفەرمووم، ئەگەر لە تووڕەییەوەیە ئەوە سزا و ڕێزداریش هەر بۆ جەنابتە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سوێند بەوەی منی بە حەق ناردووە تۆم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، تۆ بۆ من وەك پێگەی هاروون بۆ مووسا وایت، تەنها هێندە هەیە دوای من هیچ پێغەمبەرێکی تر نیە، بۆیە تۆ برا و میراتگری منیت)، عەلی وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ چی لە تۆ بە میرات دەگرم؟ فەرمووی: (ئەوەی پێش تۆ پێغەمبەران بە میراتیان گرتووە، کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەرەکەیان، تۆ براو هاودەمی منیت).

جارێك جەعفەر و عەلی و زەید پێکەوە بوون، جەعفەر وتی من لەهەمووتان لای پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستترم، عەلی وتی بەڵکو منم، زەید وتی بەڵکو منم، وتیان دەی با هەموومان بچین

بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێبکەین، ئەوەبوو چوون، ئوسامەی کوڕی زەید لەبەردەرگا بوو و داوای چوونەژوورەوەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ بە ئوسامەی فەرموو برۆ دەرەوە بزانە ئەوانە کێن؟ ئوسامەش وتی جەعفەر و عەلی و زەیدن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی مۆڵەتیان بدە، کە چوونە ژوورەوە وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستترین کەست کێیە؟ فەرمووی: (فاطیمە)، وتیان سەبارەت بە پیاو پرسیارت لێدەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أما أنت يا جعفر فأشبه خلقك خلقي، وأشبه خلقي خلقك، وأنت مني وشجرتي، وأما أنت يا علي فختني وأبو ولدي، وأنا منك وأنت مني، وأما أنت يا زيد فمولاي ومني وإلي، وأحب القوم إلي)، (تۆ ئەی جەعفەر لە هەموو کەس زیاتر شێوەت لە من دەچێت، ئاکاریشم زۆر لە ئاکارت دەچێت، تۆ لەمن و لە شەجەرەی منیت، تۆ ئەی عەلی زاواو باوکی منداڵەکانمیت و من لە تۆم

و تۆیش لە منیت، تۆیش ئەی زەید مەولای منیت و لە منیت و بۆ منیت و خۆشەویستترینی خەڵکیت بۆم).

پێغەمبەر ﷺ لە دەستکەوتەکانی هەوەزاندا کەنیزەکێکی بەخشی بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە ناوی ڕەیطەی کچی هیلال بوو، کەنیزەیەکیشی بەخشی بە عوثمانی کوڕی عەففان کە ناوی زەینەبی کچی حەییان بوو.

سەهل دەڵێت جارێك پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ماڵی فاطیمەی کچی و تەماشای کرد عەلی لەوێ نیە، فەرمووی کوا ئامۆزاکەت؟ فاتیمە وتی دەمەبۆڵەیەکمان بوو و تووڕەی کردم، دواتر چوویە دەرەوەو هیچی پێ نەوتم، پێغەمبەر ﷺ بە یەکێکی فەرموو بڕۆ بزانە لە کوێیە؟ کابرا چوو تەماشای کرد لە مزگەوتەو ڕاکشاوە و عەباکەی ژێری لاچووەو خۆڵاوی بووە، پێغەمبەر ﷺ بە دەستەکانی خۆڵەکەی لێ دەتەکاند و فەرمووی (هەستە ئەی ئەبووتوراب، هەستە ئەی ئەبووتوراب).

## لە حەجیماڵئاواییدا

بەرائی کوڕی عازب بەسەرهاتێکی بەشداربوونی لە حەجی ماڵئاوایی دەگێڕێتەوەو دەڵێت لەو حەجەدا بووین کە تیایدا پێغەمبەر ﷺ حەجی کرد، پێغەمبەر ﷺ لە نێوەندی ڕێدا دابەزی و فەرمانی کرد بە نوێژ، دەستی عەلی گرت و فەرمووی ئایا من بۆ باوەڕداران لە خودی خۆیان لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی ئایا بۆ هەر باوەڕدارێك من لە نەفسی خۆی لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی (فهذا ولي من أنا مولاه ، اللهم وال من والاه ، اللهم عاد من عاداه)، دەی ئەمە وەلی هەر کەسە کە من مەولای بم، خوایە لەگەڵ ئەوەبە کە لەگەڵیەتی و دژی ئەوە بە کە دژیەتی).

## لە کاتی وەفاتی پێغەمبەردا ﷺ

عائیشە دەڵێت کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت و ئازاری زیادی کرد، مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی تری وەرگرت تا لە ماڵی من بمێنێتەوە، ئەوانیش رازی بوون، ئەوەبوو دوو کەس ئەملاولا، پێغەمبەری خوایان ﷺ گرت و ئەویش قاچەکانی بە زەویدا دەخشان، -ئەوانیش بریتی بوون لە عەبباس و عەلی کوڕی ئەبووطالیب-

کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت، خەڵکی بە عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان وت ئەرێ پێغەمبەر ﷺ حاڵی چۆنە؟ وتی سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە، عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نابینیت؟ بەخوا من تەواو وای دەبینم پێغەمبەر ﷺ لەم نەخۆشیەیدا کۆچی دوایی دەکات، با بچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ بکەین تا بزانین کارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ کێ دەبێت، ئەگەر بۆ ئێمەیە با بیزانین،

ئەگەریش بۆ ئێمە نیە پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەكات، عەلی وتی بەخوا ئەگەر پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بكەین لەوبارەوە-داوای بكەین-و رازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر هەرگیز خەڵكی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر ﷺ ناكەم.

كاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد ئەوسی كوڕی خەولی چوو بۆ لای عەلی كوڕی ئەبووطالیب و پێی وت سوێندت دەدەم بە خوا لە شۆردن و كفنكردنی پێغەمبەری خوادا رێ بدە پشكی بەشداریمان هەبێت، بۆیە عەلی كوڕی ئەبووطالیب رێی دا بەشدار بێت لە شۆردنی تەرمی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

عەلی كوڕی ئەبوو طالیب تەرمەكەی دەشۆرد و فەضلیش جلەكەی پێغەمبەری خوای ﷺ گرتبوو تا لەبەری لانەچێت و ئەوسیش ئاوی دەكرد بەسەر تەرمەكەیدا.

## لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا

چەند شەوێکی کەم بەسەر وەفاتی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕ بووبوو، ئەبووبەکری صدیق نوێژی عەسری کرد بۆ موسڵمانان، کە لێبوونەوە هاتەدەرەوەو عەلیش لەگەڵیدا بوو دەرۆیشتن بە رێدا، ئەبووبەکر حەسەنی بینی کە لەگەڵ چەند منداڵێك یاری دەکرد، ئەبووبەکر حەسەنی گرتە قەلادۆشکان و دەیوت لە پێغەمبەر ﷺ دەچێت نەك لە عەلی، عەلیش پێدەکەنی.

مێژوونووسی شیعە یەعقووبی دەقێکی هێناوەو دەڵێت: دەستەیەك لە کۆچەران و پشتیوانان دواکەوتن لە بەیعەت دان بە ئەبووبەکر و هەواداری عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوون، لەوانە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و فەضلی کوڕی عەبباس و زوبەیری کوڕی عەووام و خالیدی کوڕی سەعید و میقدادی کوڕی عەمر و سەلمانی فارسی و ئەبووذەری غیفاری و عەمماری کوڕی یاسر و بەررائی کوڕی عازب و ئوبەی کوڕی کەعب.

ئەم مەسەلەیە پەیوەست کراوە بە ناکۆکی نێوان شیعەو سوننە لەسەر مەسەلەی خیلافەت و ئیمامەت، شیعە پێیان وایە ئیمامەت لە دوای پێغەمبەر ﷺ بە میراتی بۆ عەلی و نەوەکانی ماوەتەوە تا رۆژی دوایی و ئەبووبەکر و هاوەڵانی تر ئەو مافەیان لێ زەوت کردووە، سوننەش پێیان وایە هیچ بنەڕەتێك نیە بۆ مەسەلەی ئیمامەتی عەلی و خیلافەتی ئەبووبەکریش دروست بووە و هەموو موسڵمانانیش لەسەری کۆدەنگ بون.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئەگەر ئیمامەت بەشێکی چەسپاوی بیروباوەڕەو مافی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و نەوەکانیەتی:

یەکەم: ئەو بنەرەتە کە بڕیارە بەهەشت ودۆزەخ یەکلا بکاتەوەو ریشەی قەڵەمڕەوی هەموو کۆمەڵگەی ئیسلامیە تا رۆژی دوایی، بۆچی بە ئایەتێك راشکاوانە باسنەکراوە، ئایا ئەمە ناراستی ئەو بانگەشەیە نیە؟ یان ئەوەیە ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان لە کۆکردنەوەی قورئاندا راستیگەلێکی ناو قورئانیان لابردووە؟

جا ئەگەر بڵێین یەکەمیان راستە، ئیتر بنەرەتی بانگەشەی ئیمامەت بە دەلیلی قورئانی لەکاردەکەوێت، ئەگەریش بڵێین دووەمیان راستە، ئەوە هیچ بنەرەتێکی دروست بۆ ئیسلام نامێنێتەوە کە لەسەری بڕۆین، چونکە ئەگەر ئەوان و هاوەڵانی تر قورئانیان ناتەواو تۆمار کردبێت، کەوابوو هەم قورئان تەواوی پەیامی خوا نیە، هەم چی فەرموودەیە لەکاردەکەوێت، هەم خوێندکارەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبنە خوێندکارانێکی باش پەروەردە نەکرا و و ناپاك و هەلپەرست (دوور لەوان).

دووەم: چۆن دەکرێت عەلی کە موژدەپێدراوی بەهەشت و زاوای پێغەمبەر ﷺ و میراتگری دین و دنیایی پێغەمبەر ﷺ بێت، کەچی ئامادە نەبێت لەسەر ئەو مافە خوداییە شەڕ بکات و دەرفەت بدات کەسانێکی تر رێڕەوی بڕیاری خوا و ئایینی خوا بگۆڕن، لە کاتێکدا ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ چەندین جار لە غەزاکاندا چووەتە گەرمەی جەنگەوەو باکی نەبووە لە مان و نەمانی لە دنیادا.

ئەوەی لێرەدا بە کورتی قسەی لەسەر دەکەین بریتیە لە ئاماژەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەریەك لە ئەبووبەکر و عەلی، کۆبوونەوەی بەنی ساعیدەو بەیعەتدان بە ئەبووبەکر، ئەوانەی لە بەیعەتدان دواکەوتن، بەیعەتدانی عەلی بە ئەبووبەکر.

## چەند ئاماژەیەکی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەبووبەکر:

جارێك جوبەیر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوو کە ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ئافرەتەکە جارێکی تر بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی ئەی ئەگەر هاتمەوەو تۆم نەبینی؟ وەك ئەوەی بڵێت ئەگەر مردبوویت، ئەویش فەرمووی: (إن لم تجديني فأتي أبابكر)،(ئەگەر منت بەدی نەکرد وەرە بۆ لای ئەبووبەکر).

ئبن عەبباس دەڵێت پێغەمبەر ﷺ لە کاتی نەخۆشیەکەیدا بە پارچە قوماشێك سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی: (إنه ليس من الناس أحد أمن علي في نفسه وماله من أبي بكر بن أبي قحافة، ولو كنت متخذا من الناس خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا، ولكن خلة الإسلام أفضل، سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد، غير خوخة

أبي بكر)، (کەس نیە بەهۆی گیان و سامانیەوە منەتباری بم جگە لە ئەبووبەکری کوڕی قوحافە، ئەگەر من دۆستی زۆر نزیکم لەنێو خەڵکدا بگرتایە، بە دڵنیایەوە ئەبووبەکر دەبوو، بەڵام هاودەمی ئیسلام باشترە، لەم مزگەوتەدا چی خێمە هەیە بەروومدا دایخەن جگە لە خێمەکەی ئەبووبەکر).

عەبدوڵای کوڕی زەمعە دەڵێت کاتێك نەخۆشیەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆری بۆ هێنا، منیش هاودەم بە ژمارەیەك لە موسڵمانان لە لای بووم، بیلال بانگی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کەسێك بنێرن نوێژ بکات بۆ خەڵکەکە، منیش چووم بینیم عومەر لەناو خەڵکەکەدایەو ئەبووبەکر لەوێ نیە، وتم ئەی عومەر نوێژ بکە بۆ خەڵکەکە، عومەریش هەستا، کە الله اکبری کرد، کە پێغەمبەر ﷺ دەنگی بیست هەواڵی ئەبووبەکری پرسی، ئەوەبوو دوای ئەوە ئەبووبەکر نوێژی کرد بۆ موسڵمانان دواتر عومەر پێی وتم ماڵوێران ئیبن زەمعە چیت پێکردم، بەخوا کە وتت بەرنوێژی بکە، وامزانی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی ئەوەی

پێکردویت، ئەگەر وا تێنەگەیشتمایە بەرنوێژیم نەدەکرد بۆ خەڵکەکە، منیش وتم بەخوا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێنەکردم، بەڵام کە ئەبووبەکرم نەبینی، ئیتر تۆم بە شیاوتر زانی.

سالیمی کوڕی عوبەید باسی ساتەکانی نەخۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت و لە هۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لە هۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر ﷺ هەمدی فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان بەڵێ،

فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئێوەی ئافرەتان هاودەمە ژنەکانی یووسفن، بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و بە ئەبوبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بکات بۆ خەڵك)، هەمدی لەخۆش خۆی چوو، بیلال بانگی دا و قامەتی کرد و ئەبووبەکریش چوو بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، پێغەمبەر ﷺ هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی ئایا نوێژ دابەسراوە؟ وتم بەڵێ، فەرمووی (کەسێکم بۆ بانگ بکەن تا خۆمی پێوە بگرم)، ئەوەبوو بەریرەو کەسێکی تر هاتن و پێغەمبەر ﷺ باڵی دایە سەر شانیان و بەو حاڵەوە چوو بۆ نوێژ، لەپاڵ ئەبووبەکردا دانیشێنرا، ئەبووبەکر ویستی بگەڕێتە دواوە، پێغەمبەر ﷺ ئەبووبەکری هێشتەوە تا نوێژەکە تەواو بوو.

## چەند ئاماژەیەکی تایبەت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب:

بەرائی کوڕی عازب بەسەرهاتێکی بەشداربوونی لە حەجی ماڵئاوایی دەگێڕێتەوەو دەڵێت لەو حەجەدا بووین کە تیایدا پێغەمبەر ﷺ حەجی کرد، پێغەمبەر ﷺ لە نێوەندی ڕێدا دابەزی و فەرمانی کرد بە نوێژ، دەستی عەلی گرت و فەرمووی ئایا من بۆ باوەڕداران لە خودی خۆیان لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی ئایا بۆ هەر باوەڕدارێك من لە نەفسی خۆی لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی (فهذا ولي من أنا مولاه ، اللهم وال من والاه ، اللهم عاد من عاداه)،_دەی ئەمە وەلی هەر کەسە کە من مەولای بم، خوایە لەگەڵ ئەوەبە کە لەگەڵیەتی و دژی ئەوە بە کە دژیەتی).

ئیبن عەبباس دەڵێت کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت و ئازارەکەی زیادی کرد، فەرمووی (پەڕەیەکم بۆ بهێنن تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم تا دوای ئەوە گومڕا نەبن)، عومەری کوڕی خەططاب وتی پێغەمبەر ﷺ ئازار زۆری بۆ هێناوە،

هاوکات کتێبی خوا لەنێوماندایە بەسمانە، ئیتر قسەو مشتومڕ لەنێو هاوەڵاندا زۆر بوو تا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (قوموا عني ولا ينبغي عندي التنازع)،(لەلام هەستن و بڕۆن و شیاو نیە لە لای مندا ناکۆکی هەبێت)، ئیبن عەبباس کە ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە دەیوت ڕۆژی پێنج شەممە بوو، ئینجا دەستی کرد بە گریان و زۆر گریا.

جا شیعەو هەوادارانیان پێیان وابووە پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی ئەو نووسراوە بنووسێت بۆ عەلی کوڕی ئەبووطالیب، بەڵام عومەری کوڕی خەططاب ئەوەی زانیوە، بۆیە ڕێی لێگرتووە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت، خەڵکی بە عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان وت ئەریّ پێغەمبەر ﷺ حاڵی چۆنە؟ وتی سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە، عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نابینیت؟ بەخوا من تەواو وای دەبینم پێغەمبەر ﷺ لەم نەخۆشیەیدا کۆچی دوایی

دەکات، با بچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ بکەین تا بزانین کارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ کێ دەبێت، ئەگەر بۆ ئێمەیە با بیزانین، ئەگەریش بۆ ئێمە نیە پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەکات، عەلی وتی بەخوا ئەگەر پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکەین لەوبارەوە-داوای بکەین-و رازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر هەرگیز خەڵکی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر ﷺ ناکەم.

## بەیعەتدانی عەلی بە ئەبووبەکر:

لەم بارەیەوە دوو گێڕانەوەی سەرەکی هاتون کە بریتین لە:

گێڕانەوەی یەکەم:

کاتێك خەلیفەی باوەڕداران لە رۆژی دووەمدا بەیعەتی لە موسڵمانان وەردەگرت، هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب و زوبەیری کوڕی عەووام لەوێ نەبوون، بۆیە ئەبووبەکر داوای عەلی کرد، برێك لە پشتیوانان چوون عەلییان هێنا، ئەبووبەکر وتی ئامۆزا و زاوای پێغەمبەر ﷺ دەتەوێت ریزی موسڵمانان دووکەرت بکەیت؟ عەلی وتی کێشەم نیە ئەی خەلیفەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو بەیعەتی پێدا، ئینجا تەماشای کرد زوبەیر دیار نیە، بۆیە ناردی بە شوێنیدا و زوبەیر هات، زوبەیر وتی پورزا و حەواری پێغەمبەر ﷺ دەتەوێت ریزی موسڵمانان دووکەرت بکەیت؟ ئەویش هەمان شتی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب وتەوەو بەیعەتی پێدا.

گێڕانەوەی دووەم:

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ فاطیمە داوای لە ئەبووبەکر کرد تا لە بەجێماوی پێغەمبەر ﷺ میراتی پێ بدات، ئەبووبەکر پێیوت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (چی بە میرات جێبهێڵین صەدەقەیە)، فاطیمە بەوە تووڕە بوو و دەنگی لە ئەبووبەکر وەرگرت و تا مرد ئەبووبەکری نەدواند، کە فاطیمە وەفاتی کرد عەلی بە شەو ئەسپەردەی کرد و ئەبووبەکری بانگ نەکرد، دوای مردنی فاطیمە دەموچاوی خەڵکی شیرین نەدەبینی، بۆیە بڕیاری دا لەگەڵ ئەبووبەکر ڕێکبکەوێت و بەیعەتی پێبدات، ئەو ماوەیەش-شەش مانگە- هێشتا بەیعەتی نەدابوو، بۆیە هەواڵی نارد بۆ ئەبووبەکر و وتی وەرە بۆ لامان و با کەس نەیەت لەگەڵتدا، چونکە حەزی نەدەکرد عومەر ئامادەی کۆڕەکە بێت، عومەر کە ئەوەی زانی وتی نا بەخوا بە تەنها ناچیت بۆ لایان، ئەبووبەکر وتی بۆ پێت وایە چیم پێ دەکەن؟ بەخوا دەچم بۆ لایان، ئەبووبەکر چوو بۆ لایان، عەلی قسەی کرد و وتی ئێمە فەزڵی تۆ دەزانین و

ئاگادارین خوا چی پێ بەخشیویت، حەسودیش نابەین بەو خێرەی خوا پێیداویت، بەڵام تۆ تاکڕەوانە بێ ئێمە بڕیارت دا، ئێمە پێمان وابوو بە نزیکیمان لە پێغەمبەر ﷺ پشکێکمان دەبێت، کە ئەبووبەکر ئەم قسانەی بیست چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، ئینجا ئەبووبەکر قسەی کرد و وتی سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە، خزمایەتی و نزیکی پێغەمبەرم ﷺ لا ئازیزترە لە پەیوەندی خزمایەتی خۆم، بەڵام ئەوەی لە نێوان من و ئێوەدا سەبارەت بەو سامانە هەبووە، لەبەر چاکە بووەو بینیبێتم پێغەمبەر ﷺ چی کردبێت منیش وامکردووە، عەلی بە ئەبووبەکری وت سبەی ئێوارە وادەی بەیعەت دەبێت، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر نوێژی نیوەڕۆی کرد، چوویە سەر مینبەر و شایەتومانی وتەوەو باسی عەلی و شکۆی کرد و باسی ئەوەشی کرد کە بەیعەتی نەداوە و بیانووی عەلی بۆ ئەوە چی بووە، دواتر داوای لێخۆشبوونی لە خوا کرد، ئینجا عەلی شایەتومانی وتەوەو باسی گەورەیی مافی ئەبووبەکری کرد و وتی ئەوەی

کردوویەتی لەبەر حەسوودی بردن بە ئەبووبەکر و لەبەرچاو نەگرتنی فەزڵی نەبووە، بەڵکو پێی وابووە پشکی هەبووە لەو بوارەدا و ئەبووبەکر تاکڕەوانە بۆ خۆی بردووە، بەوە دڵیان نارەحەت بوو، موسڵمانان بەمە دڵخۆش بوون و وتیان راستت پێکا.

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەبارەت بە داواکاری ئامادەنەبوونی عومەر لەبەرئەوە بوو کە دەیانناسی عومەر لە گوفتار و کرداریشدا رەق و توندە، بەڵام ئەبووبەکر کەسێکی نەرم بوو، سەبارەت بەوەش کە دەڵێت ئەو ماوەیە بەیعەتی پێ نەداوە، لەوانەیە مەبەستی ئامادە نەبوونی بووبێت لە کۆڕ و کۆبوونەوەیدا.

نەوەوی لە شەرحی فەرموودەکەدا دەڵێت: مەبەست بەوەی دەڵێت (فاتیمە تا مرد نەیدواند) ئەوەیە کە یان لەو بارەوە حسابی میرات- نەیدواندووە، یان ئەوەیە خۆی لێ دوورگرتووە، نەك ئەوەی بە یەك بگەن و سەلام لە ئەبووبەکر

نەکات و قسەی لەگەڵ نەکات، سەبارەت بە بەیعەت نەدانەکەی عەلیش ئەوە زانایان کۆکن لەسەرئەوەی مەرج نیە بۆ دروستی بەیعەت هەموو خەڵك و هەموو ئەهلی حەل و عەقدیش بەیعەت بدەن، بەڵکو مەرجەکە ئەوەیە چەندە لە کۆی زانا و سەرکردەو پیاوماقوڵآنی ناو خەڵك بگونجێت بەیعەت بدەن، هەروەها مەرج نیە هەر کەس دەست بخاتە دەستی و بەیعەت بدات، کەسێك ملکەچ بێت و دژایەتی نیشان نەدات بەسە، عەلیش لەو ماوەیەدا ئاوا بووە، بەڵکو نەیاری نەنواندووەو ریزی کەرت نەکردووە، بەڵکو گلەییەك لە دڵیدا ماوەتەوەو وەستاوە تا ئەوە نەماوە، جا ئەم فەرموودەیە روونکردنەوەی دروستی خیلافەتی ئەبووبەکرە.

سەبارەت بە راستی ئەم دوو فەرموودەیە بەیهەقی دەڵێت: ئەو گێڕانەوەی کە دەڵێت عەلی تا دوای مردنی فاطیمە بەیعەتی نەداوە-گێڕانەوەی دووەم- مونقەطیعە، فەرموودەکەی

ئەبووسەعیدی خودری کە دەڵێت پاش ثەقیفە لە بەیعەتی گشتیدا عەلی بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکر راستترە.

ئیبن کەثیر سەبارەت بەوەی کام لەم دوو گێڕانەوەیە راستە دەڵێت: بەیعەتی پاش مەرگی فاطیمە بەیعەتی دووپات کردنەوە بوو و دووەم بەیعەت بوو، بەڵکو لەو ماوەدا عەلی لە دوای ئەبووبەکرەوە نوێژی دەکرد و بۆ راوێژ لای ئەبووبەکر بوو و لەگەڵیشیدا چوو بۆ ذیلقیصە.

## ئایا عەلی حەزی بە خیلافەت هەبووە؟

سەبارەت بەوەی ئایا عەلی حەزی بە خیلافەت هەبووە یان نا، ئەوا دەتوانین بە چەند بەڵگەیەك بیسەلمێنین کە بەڵێ، بەڵام سەبارەت بەوەی ئایا خیلافەتی بۆ واجب بووە یان نا، ئەوە هیچ بەڵگەیەکی صەحیح نیە بۆ واجب بوونی خیلافەت یان ئەوەی شیعە پێی دەڵێت ئیمامەت بۆ عەلی:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت، خەڵکی بە عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان وت ئەرێ پێغەمبەر ﷺ حاڵی چۆنە؟ وتی سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە، عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نابینیت؟ بەخوا من تەواو وای دەبینم پێغەمبەر ﷺ لەم نەخۆشیەیدا کۆچی دوایی دەکات، با بچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ بکەین تا بزانین کارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ کێ دەبێت، ئەگەر بۆ ئێمەیە با بیزانین، ئەگەریش بۆ ئێمە نیە پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەکات، عەلی وتی بەخوا ئەگەر پرسیار لە

پێغەمبەر ﷺ بکەین لەوبارەوە-داوای بکەین-و رازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر هەرگیز خەڵکی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر ﷺ ناکەم.

لە گێڕانەوەکەی بوخاریدا سەبارەت بە بەیعەتدانی عەلی بە ئەبووبەکر، کاتێك عەلی قسەی کرد وتی ئێمە فەزڵی تۆ دەزانین و ئاگادرین خوا چی پێ بەخشیویت، حەسودیش نابەین بەو خێرەی خوا پێیداویت، بەڵام تۆ تاکڕەوانە بێ ئێمە بڕیارت دا، ئێمە پێمان وابوو بە نزیکیمان لە پێغەمبەر ﷺ پشکێکمان دەبێت، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی نیازی هەبووە پشکی هەبێت.

حەسەنی کوڕی عەلی پێش مردنی حوسەینی برای بانگ کرد و ئەم وەسیەتەی بۆ کرد:

(براکەم باوکمان-عەلی- بەر رەحمەتی خوا بکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد خۆی بۆ ئەم بارە-دەسەڵآت- دانابوو و هیوای وابوو بۆ ئەو بێت، ئەوەبوو خوا دووری گرت لێی و دایە دەست ئەبووبەکر، کە ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات

هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی و بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا کە باوکمان یەکێك بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوثمان کەوت، کە عوثمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا تا شمشێری بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا وانابینم خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمەی ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە.

هەرچۆنێ بێت عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەیعەتی دا بە ئەبووبەکری صدیق، زۆریش لێی رازی بوو، عەلی دەیوت پێغەمبەر ﷺ ئەبووبەکری پێشخست بۆ بەرنوێژی لەکاتێکدا من ئامادەو لەشساغیش بووم، ئەگەر بیویستایە منی پێشدەخست، بۆیە ئەو کەسەی پێغەمبەر ﷺ بۆ دینەکەمان پێی رازی بوو، ئێمەش بۆ دنیاکەمان پێی رازی بووین،

هەروەها دەیوت چاکترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەبووبەکرو عومەرن.

کاتێك ئەبووبەکری صدیق دژبە هەڵگەڕاوەکان جەنگی ڕاگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر مەدینە دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری مەدینەدا دانا و بڕێك کەسی کرد بە ئەمیری دەستە دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود.

پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ و بەیعەتدان بە ئەبووبەکری صدیق، فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ و عەبباسی مامی پێغەمبەریش ﷺ چوون بۆ لای ئەبووبەکرو داوای میراتییان کرد، ئەبووبەکریش پێی ڕاگەیاندن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی دوای خۆی میراتی جێناهێڵێت و هەرچی جێهێشت ئەوە صەدەقەیە.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ فاطیمە داوای کرد لە ئەبووبەکر تا لە بەجێماوی پێغەمبەر ﷺ میراتی پێ بدات، ئەبووبەکر پێی وت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (چی بە میرات جێبهێڵین صەدەقەیە)، فاطیمە بەوە تووڕە بوو و دەنگی لە ئەبووبەکر وەرگرت و تا مرد هەروا بوو.

دوای ئەوەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ئومامەی کچی زەینەبی بەهاوسەرگرت کە خوشکەزای فاطیمە بوو ئەمەش لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکر صدیق و پاش جەنگی یەمامە بوو.

حەسەنی کوڕی عەلی ئامادەی کاتی وەفاتی ئەبووبەکری صدیق بوو، حەسەن دەڵێت کاتێك ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات بە عائیشەی وت ئەی عائیشە سەیری ئەو وشترە بکە کە لە شیرەکەیمان دەخواردەوەو ئەو تەشتەی بەکارمان دەهێنا و ئەو بەرگەی دەمانپۆشی، ئێمە کاتێك کاروباری موسڵمانانمان

بەدسەت بوو ئەو شتانەمان بەکاردەهێنا، جا ئەگەر مردم ئەوانە ببە بۆ عومەر، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر مرد ئەو شتانەی نارد بۆ عومەر، ئەویش وتی خوا لێت رازی بێت ئەی ئەبووبەکر، باری ئەوەی دوای خۆتت قورس کرد.

کاتێ ئەبووبەکر وەفاتی کرد بە بەرگێ دایانپۆشی و گریان مەدینەی گرتەوەو خەڵکی شڵەژان چەشنی ئەو رۆژەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، عەلی کوڕی ئەبووطالیب خێرا بە گریانەوە گەڕایەوەو دەیفەرموو (ئەمڕۆ خیلافەتی پێغەمبەر ﷺ دابڕا)، ئینجا هات تا گەیشتە بەردەرگای ئەوماڵەی ئەبووبەکری تێدا بوو، وەستا و وتی: (بەر رەحمەتی خوا کەویت ئەی ئەبووبەکر، تۆ یەکەم کەس بوویت موسڵمان بوویت، لەهەمووان پوختتر و دڵسۆزانەتر باوەڕت هێنا، دڵنیایی و بێگومانیت لە هەموان زیاتر بوو، لە هەموان لەخواترس تر و دەوڵەمەندتر بوویت و لە هەموان زیاتر لە دەوری پێغەمبەر ﷺبوویت...

پلەوپایەت لە هەموویان بەرزتر بوو، پێشرەوی هەموویان بوویت، پلەت لەهەموویان بەرزتر بوو، لە هەموویان زیاتر لە پێغەمبەری خواوە نزیك بوویت، لەرووی رەوشت و هەڵوێستەوە لە هەموان زیاتر لە پێغەمبەر ﷺ دەچوویت، لای پێغەمبەر ﷺ لە هەموویان جێ متمانەتر و پایەبەرزتر بوویت و بەرێزتریان بوویت لە خزمەتیدا، دەی خوای گەورە لەسەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە، کاتێ خەڵکی پێغەمبەری خوایان بە درۆزن دەزانی تۆ بەراستت دەزانی، بۆیە خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بە صدیق ناوی هێنایت (والذي جاء بالصدق)، کاتێ خەڵکی بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ پیسکە بوون، تۆ شوێنکەوتە و دڵنەواکەری بوویت، کاتێ خەڵکی دانیشتن و لەگەڵی نەچوون تۆ لەگەڵیدا راوەستایت، لەکاتی سەختیدا بە جوانترین شێوە هاوەڵی ئەوت کرد، سوکنایيت بۆ دەهێنا و هاورێی کۆچ و باروحاڵی نارەحەتی پێغەمبەر ﷺ بوویت، دوای پێغەمبەر ﷺ

بەجوانترین شێوە خیلافەتت کرد بۆ ئوممەتەکەی، کاتێ خەڵکی لە ئیسلام هەڵگەرانەوە بەجۆرێك ئایینی خوات بەجێگەیاند کە خەلیفەی هیچ پێغەمبەرێکی پێشتر وا بەجێی نەگەیاندووە، کاتی لاوازی هاوەڵانت بەهێز بوویت، کاتی ترسی ئەوان سەرپێ راوەستایت، وێڕای پێ ناخۆشبوونی دووروان و بێزاری و توورەیی بێباوەران دەستت گرتبوو بە رێباز و بەرنامەی پێغەمبەری خواوە، کاتێ دەورووبەرت شکستیان خوارد بە رووناکی خوا خیلافەتت گرتەدەست، لەسەروو هەموویانەوە بویت و لەهەموشیان کەمتر قسەت دەکرد و لە هەموان زیاتر راستیت دەپێکا و لە هەموان زیاتر بێدەنگ دەبوویت، رەوانبێژی و بڕیاردروستی و دلێری و دڵنیایی و کرداری چاك و شارەزاییت بە کارەکان لە هەموان زیاتر بوو، بۆ ئیسلام سەرگەورەیەك بوویت و بۆ باوەڕدارانیش باوکێکی میهرەبان، کاتێ بە خاوخێزانەوە دەهاتنە لات باری قورسی لاوازی ئەوانت دەگرتە ئەستۆ، چییان لەدەست دەدا تۆ

دەتپاراست، چییان پشتگوێ بخستایە تۆ ئاگاداری دەبوویت، کاتی کەمصەبری ئەوان خۆڕاگر بوویت، ئەوەی ئەوان هەوڵیان بۆ دەدا تۆ پێی گەیشتیت، بەهۆی تۆوە گەیشتن بەوەی کە چاوەڕێ نەبوون دەستیان بکەوێ، بۆ بێباوەران سزایەك بوویت و دەرژایت بەسەریاندا، بۆ باوەردارانیش بارانی رەحمەت و بەرەکەت بوویت، بارانی دەوڵەمەندی و سوکنایی و پارێزگاری بوویت... وەك شاخێ وابوویت کە رەشەبا نایجووڵێنێت و شکێنەرەکان لەناوی نابەن... کەسی لاواز و زەلیل لای تۆ بەهێز بوو تا مافت بۆ وەردەگرتەوە، کەسی بەهێز و بە دەسە{تیش لای تۆ زەلیل و لاواز بوو تا کاتێ مافت لێ وەردەگرتەوە، لەوەشدا دوور و نزیك لای تۆ وەك یەك بوون... بەخوا پێشڕەیو زۆرت کردو ئەوەی دوای تۆ دێت چاك ماندووی دەکەیت ... رازین بە قەزای خودا و ملکەچی کارو فەرمانی دەبین، دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ موسڵمانان بە هیچ شتێ هێندەی مەرگی تۆ موصیبەتبار نابن...

خوای گەورە بتگەیەنێتەوە بە پێغەمبەرەکەت و ئێمەش لە پاداشتت بێ بەش نەکات و دوای تۆ گومڕامان نەکات) خەڵکی بێدەنگ بووبوون تا وتەکانی تەواو بوون، دواتر هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گریان و وتیان راستت فەرموو ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا ﷺ.

## لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب ویستی بەخششی خەڵك دیاری بکات، راوێژی کرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و عەلی کوڕی ئەبووطالیب، ئەوانیش وتیان لە خۆتەوە دەست پێ بکە، چونکە تۆ شیاوتریت بەوە، عومەریش وتی نا سوێند بەخوا لە نزیکترین کەسەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەست پێ دەکەم، ئینجا لەوانەی بەشداری بەدر بوون، بەوجۆرە دەچم تا دەگاتە خۆم، یەکەمجار پێنج هەزاری بڕیەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، دواتر بۆ هاشمیە بەشداربووەکانی بەدر.

فەرموودەیەك بە صەحیحی هاتووە کە مشتومڕێك لەسەر روانینی عەلی بۆ میراتی پێغەمبەر ﷺ دەخاتەڕوو، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

مالیکی کوڕی ئەوس دەڵێت عومەری کوڕی خەططاب ناردی بە شوێن مندا، منیش چووم بۆ لای و ئەوکات خۆر لە بەرزایی ئاسمان بوو، دەبینم لە ماڵەوە دانیشتووەو لەسەر پشتیەکی

پێستە پاڵی داوەتەوە، پێی وتم ئەی مال-ناوەکەی کورت کردوەتەوە- خەڵکێ لە هۆزەکەت هاتن و منیش بەخششێکی کەمم کردن، بڕۆ لە نێوانیاندا دابەشی بکە، منیش وتم بریا کەسێکی ترت لەبری من راسپاردایە، ئەویش وتی مالیك لێنەوە، ئینجا یەرفە ؓ-پەردەدارەکەی عومەر- هات و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەت دەدەیت عوثمان و عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بێنە ژوورەوە؟ عومەر وتی بەڵێ، ئەویش مۆڵەتی پێدان و هاتنە ژوورەوە، ئینجا یەرفە ؓ هاتەوەو وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەتی عەبباس و عەلی دەدەیت بێنە ژوورەوە؟ وتی بەڵێ، مۆڵەتی دا و ئەوانیش هاتنە ژوورەوە، عەبباس وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران لەنێوان من و ئەم درۆزنە تاوانبارە ناپاکە خیانەتکارەدا دادوەری بکە-مەبەستی عەلی بوو-، ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون وتیان بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران دادوەری نێوانیان بکەو رەحم بەرامبەریان بنوێنە، -مالیك دەڵێت وام هاتە

پێش چاو ئەو چوارەش بۆ هەمان شت هاتبوون بۆ لای عومەر- ، عومەر وتی لەسەرخۆ بن، دواتر روویکردەوە ئەو دەستەیە و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، ئینجا تەماشای عەلی و عەبباسی کرد و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی دەی خوا تایبەتمەندیەکی بە پێغەمبەر ﷺ بەخشیوە کە بە هیچ کەسی تری نەبەخشیوە، لەوەش ئەوەی بەنو نەضیر بوو، دەی بەخوا تایبەتی نەکرد بە خۆی و بێبەشی نەکردن، پێغەمبەر ﷺ خەرجی ساڵێك یان خەرجی ساڵێکی خۆی و خێزانەکانی لێ هەڵدەگرت و ئەوەی دەمایەوە لە رێی خوادا دەیبەخشی، ئینجا عومەر روویکردە ئەو چوارەی تر و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا

کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەوە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، ئینجا لایکرد بە لای عەلی و عەبباسدا و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەم دوانەشتان ئەمە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ئەبووبەکر وتی من دۆست و وەلی پێغەمبەری خوام ﷺ، تۆ-عەبباسی دەدواند- و ئەمە-واتە عەلی- چوون بۆ لای ئەبووبەکر، تۆ میراتی برازاکەتت داوا دەکرد-واتە پێغەمبەر ﷺ ئەمیش میراتی ژنەکەی-واتە فاطیمە- لە باوکیەوە –واتە پێغەمبەر ﷺ داوا دەکرد، ئەبووبەکر وتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (میراتی جێناهێڵین، ئەوەی جێی دەهێڵین صەدەقەیە)، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی درۆ دەکات و تاوانبار و ناپاکە، خواش دەزانێت راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو بوو و شوێن حەق کەوتبوو، ئەوەبوو دەسەڵاتی گرتەدەست، دواتر کە ئەبووبەکر وەفاتی کرد من وتم من دۆست و وەلی پێغەمبەر ﷺ و دۆست

و وەلی ئەبووبەکرم، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی من درۆ دەکەم و تاوانبار و ناپاك و خیانەتکارم، خواش زانایە کە من راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو و شوێنکەوتەی حەقم، ئەوەبوو دەسەڵآتم گرتەدەست، ئینجا ئێستا تۆ و ئەمە و هەموو ئێوەش هاتون و قسەتان یەکەو لەو بارەوە پرسیار لە من دەکەن-واتە باری دەسەڵآت-، منیش دەڵێم ئەگەر ئەم دوانەتان دەتانەوێت ئەوە بدەمە ئێوەو بەرامبەر بەوە بەڵێنی خواتان لەسەر بێت کە بەو جۆرەی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بوو لەسەری بڕۆن، لەسەر ئەوە لە منی وەربگرن و دواتر بێن بۆ لام و داوا بکەن بە بارێکی تر-جیا لەوەی پێغەمبەر ﷺ لەسەری دەرۆیشت- دادوەری نێوانتان بکەم؟! نا بەخوا تا رۆژی دوایی جگە لەوە-کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری دەچوو- دادوەری نێوانتان ناکەم، ئەگەریش دەرەقەتی ئەوە نایەن ئەوە بیدەنەوە دەست خۆم.

لەم فەرموودەدا بۆمان دەردەکەوێت لەلایەکەوە هەموو ئەو هاوەڵانە دانیان بەوەدا ناوە کە بیستوویانە لە پێغەمبەر ﷺ میراتێ جێناهێڵێت و لەوەدا ئەبووبەکر لەسەر حەق بوو کە میراتی نەبەخشی بە فاطیمە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر بوونی کێشەی نێوان هاوەڵان و هەوڵدانیان بۆ چارەسەرکردنی، هەروەها عومەر لە هەڵوێستی عەلی و عەبباسەوە روانینی خۆی بۆ ئەو هەڵوێستەیان نیشانداوە کە لەوانەیە ئەوان ئەویش و ئەبووبەکریش بە درۆزن و ناپاك تەماشا بکەن، لەکاتێکدا بەپێی گێڕانەوەی تر کە باسمان کردووە ئەو گومانە نەبووە، بەڵام ئەم دەربڕینە هاوشێوەی ئەوەیە کەسێك کە بەرامبەرەکەی دەدوێنێت بۆ زیاتر سەلماندنی حەقبوونی دەڵێت هەرچەندە تۆ وادەزانیت من ئاواو ئاوەهام، لەلایەکەوە تا ئەگەر ناخی بەرامبەر شتێکی تێدا بێت رێی بۆ بکاتەوە تا ئاشکرای بکات، لەلایەکی تریشەوە تا پێی بڵێت من رام وایە تۆ وا بیر دەکەیتەوە.

زەمەخشەری گێڕانەوەیەکی هێناوە کە لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا کاتێك فتووحاتی فارس کرا، سێ کچی یەزگوردی کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرا بە کەنیزەك گیرابوون و هێنران بۆ خەلیفەی باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب، ئەویش ویستی بیانفرۆشێت، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوو طالیب وتی کچانی پاشاکان نافرۆشرێن، بۆیە پارەی هەموویانی دا و دابەشی کردن لە نێوان حوسەینی کوڕی و موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر و عەبدوڵای کوڕی عومەردا.

عومەری کوڕی خەططاب پاش ئەوەی پێکرا، شەش کەسی راسپارد تا لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن بۆ خیلافەت، ئەوانیش بریتی بوون لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب، عوثمانی کوڕی عەففان، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، زوبەیری کوڕی عەووام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف.

عومەری کوڕی خەططاب ئەگەری دانا بۆ درووستبوونی راجیایی لەسەر دیاریکردنی کەسێك و چارەسەری بۆ داناو وتی ئەگەر سێ کەس سێ کەس کەوتن (واتە بوون بە دوو بەشەوە) ئەوە عەبدوڵای کوڕی عومەر بکەن بە دادوەری نێوانیان، ئەگەریش بە دادوەری ئەو رازی نەبوون، ئەوە لەگەڵ ئەو دەستەیە بن کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی تێدایە.

ئەوەبوو دواجار سیانیان وازیان هێنا لە مافەکەیان بۆ ئەوانی تر، مانەوە سەر عەبدوڕەحمان و عەلی و عوثمان، عەبدوڕەحمان وتی منیش لەپێناو خوادا واز لە مافەکەم دێنم و ئێوەش یەکێکتان وازبهێنن تا بەیعەت بدەین بەوی تر، دواجار ئەهلی شوورا بڕیاری کۆتاییان دایە دەست عەبدوڕەحمان، ئەویش کەوتە وەرگرتنی رای خەڵکی و تەنانەت رای ژن و منداڵیشی وەرگرت، رای سوارەو پیادەکانیشی وەرگرت، سێ شەو و رۆژ بەردەوام بوو لەو راوەرگرتنەی، رای زۆرینەی هەرەزۆر لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان بوو، دواجار لەبەری بەیاندا

مێزەرەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردە سەر و ناردی بە شوێن ناودارانی ناو کۆچەران و پشتیوانان و خەڵکی ترداو مزگەوت پڕ بوو لە خەڵك، چوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ و ماوەیەکی زۆر وەستا و بە دەنگی نزم نزایەکی زۆری کرد، دواتر خەڵکەکەی دواند، ئینجا عەلی بانگ کرد و دەستی گرت و وتی لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی و کرداری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێدەدەیت؟ وتی ناوەڵآ، بەڵکو هێندەی توانام هەبێت، عەبدوڕەحمان دەستی بەردا و عوثمانی بانگ کرد و دەستی گرت و هەمان شتی بەویش وت، عوثمان وتی بەڵێ بەخوا، ئەوەبوو عەبدوڕەحمان لە شوێنەکەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت و عوثمانیش لە پلیکانەی خوارترەوەو خەڵکەکە هاتن بەیعەتیان دا بە عوثمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبوطالیبیش بەیعەتی پێدا.

جا بڕێك دەق هاتون كە عەلی كوڕی ئەبووطالیب بەو بڕیارە ناڕازی بووبیت و ئەوەی بە فێڵ دانابێت، ئیبن كەثیر دەڵێت: (ئەوەی زۆرێك لە مێژوونووسانی وەك ئیبن جەریر و كەسانێكی تر لە بڕێك كەسی نەناسراوەوە تۆماریان كردووە گوایە عەلی بە عەبدوڕەحمانی وتووە تۆ منت خەڵەتاند و تۆ لەبەر خزمایەتی و لەپێناو ئەوە عوثمانت دانا تا لە هەموو شتێكدا رات وەربگرێت و...هەموو ئەمانە پێچەوانەی تۆماری صەحیح و دروستن و دەدرێنەوە بە رووی خاوەنەكانیاندا).

كاتێك عومەری كوڕی خەططاب وەفاتی كرد، خەڵكێ نزایان دەكرد بۆ عومەر، عەلی كوڕی ئەبووطالیبیش وتی رەحمەتی خوات لێ بێت، هیوام وایە خوای گەورە لەگەڵ دوو هاوڕێكەت كۆت بكاتەوە-پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەكر- چونكە من زۆر جار لە پێغەمبەری خوام ﷺ دەبیست دەیفەرموو من و ئەبووبەكر و عومەر بووین، من و ئەبووبەكر و عومەر وامانكرد، من و ئەبووبەكر و عومەر چووین.

## لە ماوەی خیلافەتی عوثماندا

پاش ئەوەی بەیعەت درا بە پێشەوا عوثمان، عەلی کەسی نزیکی عوثمان بوو و لە زۆر کاتدا هاودەمی بوو و عوثمانیش رای ئەوی زۆر لا پەسەند بوو و لە مەسەلەکاندا رای وەردەگرت، بۆ نموونە کاتێك حەببانی کوڕی مونقیذ ژنەکەی تەلآق دا، ئەوکات ژنەکەی شیری دەدا، ماوەی حەقدە مانگ تێپەڕ بوو و ئەو ژنە لەبەر شیردانەکە نەدەکەوتە حەیزەوە، دوای چەند مانگێك لەو تەلآقدانە حەببان نەخۆش کەوت، پێی وترا ئەگەر بمریت ژنەکەت میراتی بەردەکەوێت، ئەویش وتی بمبەن بۆ لای عوثمان، برا بۆ لای عوثمان و هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و زەیدی کوڕی ثابت لای عوثمان بوون، کاتێك مەسەلەکەی باسکرد، عوثمان بەو دوو هاوەڵەی لای خۆی وت راتان چیە؟ ئەوانیش وتیان رامان وایە ئەگەر بمرێت ژنەکەی میراتی بەردەکەوێت، ئەگەریش ژنەکە بمرێت ئەوا حەببان میراتی بەردەکەوێت،

چونکە لەو ئافرەتانە نیە کە ئیتر قەت تووشی حەیز نەبن، لەو ئافرەتانەش نیە کە هەرگیز تووشی حەیز نابن، ئەوەبوو حەببان گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو کچە شیرەخۆرەکەی لای ژنەکەی بردەوە، ئیتر ژنەکە کە شیردانی نەما کەوتە حەیزەوە، بەڵام دوو جار کەوتە حەیزەوە تا ئەوەی حەببان مرد هێشتا ژنەکەی حەیزی نەبوو، بۆیە ژنە تەڵاقدراوەکەی حەببان میراتی بەرکەوت، حەببان دوو ژنی هەبوو، یەکێکیان قورەیشی بوو و ئەوی تریان پشتیوانی بوو، ئەوەی کە حەببان تەڵاقی دابوو ژنە پشتیوانیەکە بوو.

لەساڵی سی و چواری کۆچیەوە سەرەتاکانی فیتنە دەرکەوتن کاتێك دەستەیەك کەوتنە رەخنەگرتن لە عوثمانی کوڕی عەففان، سەرەتای رەخنەکەیان ئەوەبوو وتیان ئەو هاوەڵانێکی زۆری لە پۆستەکاندا لابردووەو کەسانی ئومەوی لە شوێنیاندا داناوە، ئەویش ئەو قسەی زۆر لا سەخت بوو و ناردی بە شوێن والی ناوچەکاندا و هەموو هاتن بۆ لای، لەوانە موعاویەی

کوڕی ئەبووسوفیان و عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی سەعد و سەعیدی کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی عامیر، لەو بارەوە رای ئەوانی وەرگرت، هەریەکەو رایەکی دەربڕی، عوثمانیش والیەکانی هێشتەوەو هەوڵیدا کەسە نارەزاکانیش بە جیهادەوە سەرقاڵ بکات، هۆکاری سەرەکی ئەم بەزمانەش کابرایەکی جوولەکە بوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی سەبە ؐ کە وای نیشان دابوو موسڵمان بووە، ئینجا چوویە میصر و لەوێ فیتنەیەکی نایەوەو گومانی بۆ خەڵکەکە دروست دەکرد، کورتەی وتەکەی ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی کردووە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، بۆیە عەلی لە عوثمان شیاوترە بە دەسەلآت، ـوەك ئەوەی ئەو هەموو هاوەڵەی دەوری پێغەمبەر ﷺ ئاگایان لە شتی وانەبووبێت و ئێستا کابرایەکی جوولەکەی تازە موسڵمان بوو کە ساتێکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ نەبووە ئەم مەسەلە گرنگەی

زانیبێت، ئیتر تەنها ئەم لەسەر حەق و هەموو هاوەڵان یان نەزان یان فێڵباز بووبن.

ئیبن سەبەئی جوولەکە کەوتە تانەدان لە عوثمان و خۆی بە دڵسۆزی ئیسلام نیشان دا، خەڵکێکی زۆر بە قسەکانی هەڵخەڵەتان و کەوتنە شوێن راکانی و ئەو هەوڵەی خۆیان بە فەرمان بە چاکەو رێگری لەخراپە دەزانی، رۆژ بە رۆژ ئەو بیرەی سەبەئی بلآو دەبوویەوە، تا دوای ساڵێك خەڵکەکە داوایان کرد لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب بڕوات لەگەڵ عوثمان قسە بکات، عەلیش چوو و پێی وت: خەڵکێك لە دەرەوە سەبارەت بە تۆ منیان دواندووەو نازانم چی بڵێم، چی هەیە تۆ نەیزانیت و ئەوەی ئێمە دەیزانین تۆیش دەیزانیت، پێش تۆ نەکەوتوین تا شتێکت پێ بڵێین تۆ نەیزانیت، بە تەنیا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەبوین تا شتیکی تایبەت بزانین و پێت بڵێین، شتێکی تایبەتمان بۆ نەبووە کە لە تۆشاراوە بێت، تۆ هاوەڵ و زاوای پێغەمبەری خوا ﷺ بوویت و فەرموودەت لێوە

بیستووەو بینیوتە، کوڕی ئەبووقوحافە و کوڕی خەططابیش لە تۆ لەپێشتر نەبون بە شتێك،تۆ لە خزمایەتیدا نزیکترینیت بە پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی تۆ هەتبوو لە زاوایەتی پێغەمبەر ﷺ ئەو دوانە نەیانبوو، لە هیچدا پێش تۆ نەکەوتن، دەی بۆ خاتری خوا وریای خۆت بە، نابینات پێ بینا ناکرێت و نەفامت پێ زانا ناکرێت، رێگەکە روونەو پایەکانی دین وەستاون، تۆ دەزانیت ئەی عوثمان چاکترین بەندەی خوا لای خوا پێشەوایەکی دادپەروەرە رێنموونی کرابێت و سوننەتێکی روون پەیڕەو بکات و دوور لە بیدعەی دیار بگرێت، بەخوا هەردووکیان رونن و سوننەتەکان وەستاو و بەرچاون و بیدعەکانیش هەروا، خراپترین کەس لای خوا پێشەوایەکی ستەمکاری گومڕایە کە خەڵکی بەهۆیەوە گومڕا بین، ئیتر سوننەتی روون لەناوبەرێت و بیدعەی کەنارخراو زیندوو بکاتەوە، ...

عوثمانیش وەڵامی دایەوەو وتی بەخوا دەمزانی ئەوە دەڵێیت، بەخوا ئەگەر تۆ لە شوێنی من بوویتایە، نە لێت تووڕە دەبووم و نە تانەم لێدەدایت و نە خراپەیەکم دەکرد، من خزمایەتیم گەیاندووەو درزەکانم گرتووەو پەنای فەوتاوم داوەو لەسەر هەمان شێوەی عومەر کەسەکانم داناوە، ئەی عەلی سوێندت دەدەم بە خوا ئایا دەزانیت موغیرەی کوری شوعبە لێرە نەبوو؟ وتی بەڵێ، وتی دەشزانیت عومەر داینا؟ وتی بەڵێ، عوثمان وتی دەی ئیدی بۆ سەرکۆنەی من دەکەن ئەگەر ئیبن عامیرم لەبەر خزمایەتی دانابێت؟ عەلی پێی وت عومەر کە کەسێکی دادەنا دواتر لاریەکی لێ بەدی بکردایە ئەوپەڕی سزای دەدا، بەڵام تۆ ئەوە ناکەیت، نەرمی و لاوازیت نواندووە بەرامبەر بە خزمانت، عوثمان وتی ئەوانە خزمانی تۆیشن، پاش بڕێك قسەکردن پێکەوە عەلی لای عوثمان چوویە دەرەوەو عوثمانیش بە دوایدا چوویە دەرەوەو چوویە سەر مینبەر و وتارێکی پێشکەش کرد.

لە ساڵی سی و پێنجی کۆچیدا میصر شڵەژانێکی بەخۆوە دی، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکری صدیق و موحەممەدی کوڕی ئەبووحوذەیفەو ژمارەیەکی تر لە نەیارانی عوثمان نزیکەی شەش سەد سواریان لە میصرەوە ئامادە کرد و بەڕێکەوتن بەرەو مەدینە و بوون بە چوار بەشەوە بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی و عەبدوڕەحمانی بەلوی و کینانەی کوڕی بیشر و سوودانی کوڕی حمران، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکریش لەگەڵیاندا هات، بەڵام موحەممەدی کوڕی ئەبوحوذەیفە لە میصر مایەوە تا خەڵکی تر هان بدات و بەرگری لەوانە بکات کە ڕۆیشتوون، والی میصریش نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەو ئاگاداری کردەوە لەو ڕووداوە و وتی وەك عومرەکار دێن و وا خۆیان نیشان دەدەن، کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، خەلیفە فەرمانی کرد بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب تا پێشهاتنیان بۆ مەدینە بیانگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆیان، عەلیش داوای لە عەمماری کوڕی یاسر کرد

هاودەمی بکات، بەڵام عەمار رازی نەبوو، چونکە ئەویش تووڕە بوو لە عوثمان لەبەرئەوەی پێشتر عوثمانی کوڕی عەففان سزای دابوو، عەلی خۆی چوو بۆ لایان و لە ناوچەی جوحفە بوون، ئەوانە بە چاوی گەورەییەوە تەماشای عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان دەکرد، عەلی لێیان تووڕە بوو و تەنانەت کەوتە قسە پێ وتنیان، ئەوانیش کەوتنە سەرکۆنەی خۆیان و وتیان لەسەر ئەمە جەنگی خەلیفە دەکەن؟ عەلی وتی بۆچی نەیاری عوثمانن؟ ئەوانیش چەند رەخنەیەکیان ژمارد، عەلیش یەك یەك وەڵامی رەخنەکانی ئەوانی دایەوە، دەستەیەکیشیان چوون گوێیان لە وتەکانی عوثمان گرت، کە هیچ رەخنەیەکیان نەما، دەستەیەك لە خەڵکی مەدینە داوایان لە عوثمان کرد سزای ئەوانە بدات، عوثمان لێبوردەیی نیشان دا، ئەوانیش گەڕانەوە و عەلیش گەڕایەوە بۆ لای عوثمان و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد و داوایشی لێکرد وتارێك پێشکەش بکات و پۆزش بهێنێتەوە بۆ ئەوەی خزمانی خۆی پێشخستووەو تەوبە نیشان

بدات، عوثمانش راکەی وەرگرت و لە وتاری هەینیدا ئەوەی کرد و نزایەکی تەوبەی کرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و هەموو موسڵمانان گریان، ئینجا مەڕوانی کوڕی حەکەم وتەیەکی زبری پێشکەش کرد و دڵی عەلی رەنجاند، دواتر عوثمان بە راوێژی ژنەکەی ناردی بە شوێن عەلیدا تا بێت بۆ لای و ویستی دڵی بداتەوە، بەڵام عەلی رازی نەبوو، کە خەڵکی میصر بەم رووداوەیان زانی لەگەڵ خەڵکی کووفەو بەصرە کەوتنە نامە گۆڕینەوەو رێککەوتن لەسەر ئەوەی جەنگی عوثمان بکەن، لەو نێوەندەدا برێك نامە بەدەم هاوەڵانەوە ساختە کران، ئەوەبوو هەمدی شەش سەد سوار لە میصرەوە بە چوار بەش هاتن وئیبن سەبەئیشیان لەگەڵ بوو، لەو لاشەوە خەڵکی کووفە بە چوار بەش هاتن، خەڵکی بەصرەش بە چوار بەش هاتن، هەریەکەو نیازێکیان هەبوو، میصریەکان دەیانوت دەبێت عەلی ببێت بە خەلیفە، کووفیەکان دەیانوت با زوبەیر ببێت بە خەلیفە، بەصریەکان دەیانوت با طە

لحە ببێت بە خەلیفە، هەموو لە مانگی شەووالدا لە دەوری مەدینە خڕ بوونەوە، میصریەکان چوون بۆ لای عەلی، ئەویش حەسەنی کوڕی ناردبوو بۆ لای عوثمان و خۆیشی کەناری گرتبوو، کە هاتن بۆ لای عەلی تووڕە بوو لێیان و دەری کردن، زوبەیر و طەلحەش بە هەمان شێوەی عەلی بانگەشەکەرانی خۆیانیان دەرکرد ونەفرەتیان لێکردن، ئینجا هەموویان نیازی خۆیان راگەیاند و وتیان داوای ئێمە ئەوەیە عوثمان واز لە خیلافەت بهێنێت، جا میصریەکان دەیانوت جاری پێشوو کە چووینەتەوە نێردراوی عوثمانمان بەدیل گرتووە کە نامەی پێ بووەو نامەکە مۆری عوثمانی لەسەر بووەو تیایدا فەرمانی کردووە هەموومان بکوژن و دەست و پێیان ببڕن، ئەو نامەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کە عوثمان ئەوەی بیست سوێندی خوارد شتی وای نەوتووەو نەنووسیوە، ئەمەش نامەیەکی ساختە بوو ئامادە کرابوو،

هەروەك نامە بە دەم عەلی و زوبەیر و طەلحەوە نووسرابوو کە بێن بۆ لەناوبردنی عوثمان، وەزعەکە بەو جۆرە بوو تا رۆژی هەینی هات و عوثمان وەك جاران وتاری خۆی پێشکەش کرد، هێندێ دوای ئەوە گەمارۆ درا.

لە مانگی ذیلقەعدەی ساڵی سی و پێنجدا هاتنە ناو مەدینە، عوثمان چاوی کەوت پێیان، ئەوانیش وتیان قورئانێك داوا بکە، ئەویش داوای کرد قورئانێك بهێنن، -کە قورئانەکەی بۆ هێنرا-پێیان وت –سورەتی- نۆیەم بکەرەوە، واتە سورەتی (یونس)، ئینجا وتیان بیخوێنەرەوە تا گەیشتە ئەم ئایەتە (أذن لكم أم على الله تفترون)، ئینجا پێیان وت بوەستە، (أرأيت ما حميت من الحمى)، ئایا خوا مۆڵەتی ئەوەی پێداویت یان بەدەم خواوە هەڵت بەستووە؟ عوثمان وتی تێیپەڕێنە، ئەو ئایەتە لەسەر فلاّنە مەسەلە دابەزیوە، عومەریش ئەوەی منی کرد و لە وشترەکانی زیادکرد و منیش وام کردووە.

بەردەوام رەخنەیان لێدەگرت و ئەویش وەڵامی دەدانەوە تا دواتر عوثمان بەوانی وت چیتان دەوێت؟ ئەوانیش بەڵێننامەکەیان هێنا و شەش یان پێنج مەرجیان بۆ نووسی کە هەرکەس دوورخراوەتەوە بگەڕێنرێتەوەو ئەوەی -مووچەی لێ بڕاوە- بۆی بگێردرێتەوە و فەیئیش هەبێت و لە دابەشکردندا دادپەروەر بێت و کەسانی بەهێز و جێمتمانە بکاتە بەرپرس، ئەوەیان لە نامەیەکدا نووسی، ئەویش بەڵێنی لەوان وەرگرت یەکرێزی تێکنەدەن، ئینجا بە رەزامەندی گەڕانەوە.

دەوترێت بەڵکو عەلی ناردووە بۆ لایان و لەسەر ئەو پێنج شتە باسکراوە رێککەوتن و بە رەزامەندی گەڕانەوە، لەو وەزعەدا بوون کە سوارێك هات و رێی گرت پێیان و چەند جارێك بلاوەی بە کۆبوونەوەیان دەکرد و دەهاتەوە بەنێویاندا، وتیان ئەوە تۆ چیتە؟-بۆ وادەکەیت؟- ئەویش وتی من نێردراوی ئەمیری باوەڕدارانم بۆ لای کاربەدەستی خۆی لە میصر، ئەوانیش پشکنیان، سەیریان کرد نامەیەکی پێیە کە لەسەر

زمانی عوثمان نووسراوەو مۆری ئەوی لێدراوەو ناردوویەتی بۆ کاربەدەستی میصر و فەرمانی پێکردووە-ئەو کۆمەڵە کە گەڕانەوە- لە خاچیان بدات و دەست و پێیان ببڕێت.

ئەوانیش گەڕانەوە بەرەو مەدینەو چوون بۆ لای عەلی و پێیان وت سەیرکە دوژمنی خوا چی کردووە؟!! چی لە بارەمانەوە نووسیوە خوا خوێنی ئەوی حەلآڵ کردووە، ئینجا بە عەلییان وت لەگەڵ ئێمە وەرە بچین بۆ لای –عوثمان، ئەویش وتی بەخوا نایەم لەگەڵتان، وتیان ئەی بۆچی –پێشتر- بەڵێننامەت بۆ نووسین؟ ئەویش وتی بەخوا من بۆم نەنووسیون، ئەوانیش لەنێو خۆیاندا سەیری یەکتریان دەکرد، ئینجا عەلی لە مەدینە چوویەدەرەوە.

ئەوانیش چوون بۆ لای عوثمان و پێیان وت: تۆ شتی وات لە بارەی ئێمەوە نووسیوە، ئەویش وتی یان دەبێت دوو موسڵمان بهێنن-کە شایەتیم لەدژ بدەن- یان من سوێند دەخۆم-شتی وام

نەنووسیوە-. بەڵام ئەوان بەوە رازی نەبوون و بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوەو گەمارۆیان دا،

چەند قسەو راگۆڕینەوەیەك لەنێوان عوثمان و یاخیبواندا روویدا، دەوترێت ئەشتەر هێنراوە بۆ لای عوثمان، ئەشتەریش بە عوثمانی وت ئەو خەڵکە دەیانەوێت یان واز لە دەسەڵآت بهێنیت، یان قیصاصیان بدەیتەوە، یان بتکوژن، ئەویش وتی: سەبارەت بە وازهێنانم ئەوا من ئوممەتی موحەممەد بە پەرتی و ناکۆکی جێناهێڵم، سەبارەت بە قیصاصیش ئەوا دوو هاوەڵەکەی پێش من قیصاصیان لەخۆیان وەرنەگرتووەو جەستەی منیش بەرگەی ئەوە ناگرێت.

عوثمان پاش کۆتا وتاری لە هەینیدا، تووشی ژانەسەرێك بوو و لە هۆش خۆی چوو، خێرا بردیانەوە بۆ ماڵەوە، خێرا نەیارەکانی کە لەو شوێنە جیاوازنەوە هاتبوون، هاتن و گەمارۆی ماڵەکەیان دا، بەرامبەر بەوە خێرا دەستەیەك لە مندالآنی هاوەڵان بە فەرمانی باوکیان چوون بۆ ماڵی عوثمان تا بەرگری

لە خەلیفە بکەن، لەوانە حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و عەبدوڵای کوڕی عەمر.

کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی توورە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو بۆگزێکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەشداری ئەسپەردەکردنی تەرمی عوثمانی کوڕی عەففان بوو، ئەسپەردەکردنەکەش لەنێوان نوێژی ئێوارەو عیشادا بوو هاودەم بە ژمارەیەکی کەمی

هاوەڵان کە حەکیمی کوڕی حیزام و زەیدی کوڕی ثابت و عەلی کوڕی ئەبووطالیب و زوبەیری کوڕی عەوام و کەعبی کوڕی مالیك و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و ژنەکانی عوثمانی تێدا بوو، شۆردرا و کفن کرا و نوێژی لەسەر کرا، هەندێ لە خەواریجەکان ڕێیان پێ دەگرتن ودەیانویست تەرمەکەی بەردباران بکەن و دواتر لە گۆڕستانی جوولەکەکان ئەسپەردە بکرێت، عەلی کەسێکی نارد بۆ لایان و ڕێگری کرد لێیان، چەند جار هەوڵ درا ڕێ نەدەن لە گۆڕستانی بەقیعیش ئەسپەردە بکرێت، بۆیە لە دەرەوەی بەقیع ئەسپەردە کرا تا کاتێك موعاویە بوو بە خەلیفە ئەو دیوارەی نێوانی لابرد، دواتر تەرمی دوو خزمەتکارەکەی عوثمانیشیان هێنا کە کوژرابوون و لەپاڵ عوثماندا ئەسپەردە کران.

## خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب

لەبەرئەوەی نووسینەوەی وەردەکاریەکانی ژیانی عەلی کوڕی ئەبووطالیب پێویستی بە سەدان لاپەڕە هەیە، چ جای وردەکاری ماوەی دەسەڵاتەکەی، بۆیە وەك چۆن بۆ هاوەڵانێکی تر وامانکرد، بۆ ژیانی ئەم هاوەڵە ئازیزەیش وردەکاریەکان جێدێڵین بۆ خوێنەر تا لە سەرچاوەکانی ترەوە بیخوێنێتەوە کە بە زمانی کوردی سوپاس بۆ خوا بەردەست دەکەون، لێرەدا تەنها بە کورتی چەند لایەنێکی ماوەی دەسەڵاتەکەی دەخەینەڕوو تا کاتی شەهیدبوونی.

کاتێك عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو بە خەلیفە، ئیبن عەبباسی کرد بە والی شام و وتی بڕۆ بۆئەوێ، بەڵام ئیبن عەبباس رازی نەبوو و وتی ئەگەر موعاویە نەمکوژێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە بەندم دەکات، پاشان بە عەلی وت موعاویە بکە بە کاربەدەستی خۆت و دواتر لایبەرە، بەڵام عەلی بەو رایەی ئیبن عەبباس رازی نەبوو.

کاتێك عەلی ویستی کەسێك بنێرێت بۆ لای موعاویە تا بەیعەتی لێ وەربگرێت، جەریری کوڕی عەبدوڵا وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران من دەڕۆم، چونکە خۆشەویستیەك لە نێوان من و ئەودا هەیە، دەڕۆم و بەیعەتی لێ وەردەگرم بۆت، ئەشتەر لەوێ بوو وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران جەریر مەنێرە ئەترسم هەواداری موعاویە بێت و لای بمێنێتەوە، عەلی وتی وازی لێ بهێنە، ئەوەبوو نامەیەکی نووسی بۆ موعاویەو تیایدا هەواڵی پێدا کە کۆچەران و پشتیوانانیش بەیعەتیان پێداوە، باسی رووداوی جەمەلیشی بۆ نووسیبوو، داوایشی لێکرد وەك ئەو خەڵکەی تر بەیعەتی پێبدات، ئینجا جەریر خەڵکی کۆکردەوەو وتارێکی پێشکەش کرد و تیایدا داوای لە موعاویە کرد گوێڕایەڵی بنیۆنێت و ناکۆکی نەنێتەوەو نەبێتە هۆی جەنگی نێوان موسڵمانان، موعاویەش داوای کرد پەلەی لێ نەکات تا رای خەڵکی شام وەربگرێت، کە جەریر نامەکەی دا بە موعاویە، موعاویە عەمری کوڕی عاص و گەورەکانی خەڵکی

شامی کۆکردەوەو راوێژی کرد بە هەموویان، ئەوانیش وتیان تا بکوژانی عوثمان نەکوژرێنەوە بەیعەت نادەین یان دەبێت بکوژەکانی عوثمانیان بدرێنە دەست، ئەگەرنا جەنگی لەگەڵ دەکەن و بەیعەتی پێ نادەن، ئەوەبوو جەریر گەڕایەوەو هەواڵەکەی دا بە عەلی، ئەشتەر وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مەگەر من نەموت جەریر مەنێرە ئەگەر منت بناردایە موعاویە هەر دەرگایەکی بکردایەتەوە دامدەخست، جەریر بە ئەشتەری وت ئەگەر تۆ بوویتایە لە بری خوێنی عوثمان دەیانکوشتیت، ئەوەبوو ئەشتەریش بە توند وەڵامی دایەوە، ئەمە جەریری تووڕە کرد، بۆیە جەریر چوو بەرەو قرقیسیا و نامەی نارد بۆ موعاویەش کە چی وتووەو چی پێ وتراوە، موعاویەش نامەی بۆ نووسی و داوای لێکرد بچێت بۆ لای بەڵام ئەو کەناری گرت و لە قرقیسیا مایەوە تا لەوێ مرد.

## لێدانی هەڵگەڕاوەکان:

لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا خەڵکێك لە یەمەن لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئەوەبوو عەلی سوپایەکی ئامادە کردو جاریەی کوڕی قودامەی کرد بە سەرکردەی سوپاکەو ناردی بۆ ئەوێ، لەوێ هەموو ئەوانەی کۆکردەوە کە لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوەو دای لە گەردنی هەموویان و بە ئاگریش جەستەی ئەوانی سووتاند، چونکە عەلی کوڕی ئەبووطالیب فەرمانی بەو کارە کردبوو.

هەروەها عەلی کوڕی ئەبووطالیب بیستی بوسری کوڕی ئەرطهئە لە حیجاز چ خوێنرێژیەکی کردووە، بۆیە جاریەی کوڕی قودامەی نارد بۆ حیجاز، ئەویش چوو بۆ ئەوێ و هەرکەسی ببینیایە بەیعەتدان بە عەلی هەڵوەشاندبێتەوە دەیکوشت.

## فیتنەی سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیب

کاتێك عوثمان شەهید کرا دوای ئەوە بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو بەیعەتەکە هەموو موسڵمانانی لەخۆنەگرت، بەڵکو بەهۆی راجیایی سەبارەت بە خوێنی عوثمان فیتنەیەك لەنێوان هاوەڵاندا روویدا، ئەویش بوویە هۆی رووودانی هەردوو جەنگی جەمەل و صفین، دواجاریش کێشەکە هەر بەو بارەیەوە مایەوە تا لەسەر دەستی حەسەنی کوڕی عەلی فیتنەکە کوژایەوە.

بەو بەیعەتدانە موعاویە لە شام و خەڵکی شام مانەوەو بەیعەتیان نەدا بە عەلی، جگە لەوەی طەلحەو زوبەیرو دایکی باوەڕداران عائیشەش ئیجتیهادیان وابوو دەبێت بکوژانی عوثمان یەکسەر بکوژرێنەوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبووطالیب رای وابوو پەلە نەکرێت لە کوشتنەوەیان چونکە ئەوان لەناو مەدینەدان و سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامیش لە

دەرەوەن و ئەگەر خێرا بکرێت لە لێدانیان لەوانەیە بتوانن مەدینە بگرن.

بەهەرحاڵ ئەمە بوویە هۆی کەوتنەوەی فیتنەیەکی گەورە کە ئەنجامێکی دڵتەزێنی هەبوو بۆ موسڵمانان و تا ئەمڕۆش ئاهی داخی ئەو فیتنەیە لای موسڵمانان گەرمەو هێشتا خەفەتیان بەو فیتنەیە دانەمرکاوەتەوەو بووە بە چەکێك بەدەست دوژمنانی ئیسلام و مێژووی ئیسلامی و هاوەڵانەوە تا داخی دڵی خۆیان بڕژن.

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان کوژرا، دایکانی باوەڕداران (هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ چووبوون بۆ حەج بۆ مەککە تا لەدەست ئەو فیتنەی مەدینەی گرتووەتەوە رزگار بن، کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە مەککە، هەواڵیان پێگەیشت کە عوثمان کوژراوە، بۆیە لە مەککە مانەوە تا بزانن بارەکە بە چی دەگات، ئەوەبوو بێ پێشنیازی خۆی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب بەیعەتی پێدرا، بەتایبەت کە خەواریجەکان زۆریان لە عەلی

کرد هەرچەندە عەلی خۆی رقی بوو لێیان، بەڵام هیوای وابوو دەرفەتێکی بۆ بگونجێت تا لەناویان بەرێت، ئەوەبوو کە ئەو فشارە بینرا ژمارەیەك لە خزمانی عوثمان لە بەنوئومەییە دەرچوون بۆ مەککە، هەریەك لە زوبەیر و طەلحەش داوای مۆڵەتیان کرد تا بچن بۆ مەککەو عەلیش مۆڵەتی پێدان و ئەوانیش چوون بۆ مەککە، خەڵکێکی زۆریش شوێنیان کەوت، لە بەصرەو مەدینەو یەمەن و چەند شوێنی ترەوە خەڵکێکی زۆر روویکردە مەککەو لەوێ ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان و دایکانی باوەڕداران و جەماوەرێك کۆبوونەوەو داوای خوێنی عوثمانیان دەکرد، عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش جڵەوی مەسەلەکەی گرتبوویەدەست.

## وەستانێك:

سەبارت بە بەیعەتدانی طەلحەو زوبەیر بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب مشتومڕێك هەیە کە ئایا بە ویستی خۆیان بەیعەتیان داوە یان بە ناچاری.

کاتێك بەیعەت درا بە عەلی، عەلی داوای هەریەك لە طەلحەو زوبەیری کرد، ئەوانیش هاتن، طەلحە دەیویست بەیعەت نەدات، بەڵام مالیکی ئەشتەر شمشێری هەڵکرد و وتی بەیعەت نەدەیت دەدەم لە گەردنت، ئەویش بە ناچاری بەیعەتی داو زوبەیریش بە دوایدا بەیعەتی دا.

لە گێڕانەویەکی تردا هاتووە عەلی بەوانی وت یان ئێوە بەیعەتم پێ بدەن یان من بەیعەتتان پێ دەدەم، ئەوانیش وتیان ئێمە بەیعەتت پێ دەدەین.

طەلحە وتی من کاتێك بەیعەتم داوە کە شمشێر لە گەردنم بووە، هەریەك لە سەعدو ئوسامەی کوڕی زەید شایەتییان داوە کە بەیعەتەکەی طەلحە زوبەیر ناچاری بووە.

## لێرەدا پێم خۆشە پوختەیەکی نووسینەکەی ئیبنولعەرەبی بەش بەش بە هەمان دەقی خۆی دابنێم:

کاتێك قەدەری خوا هات و ئەوەی لە قەدەردا هەبوو روویدا و حەق هەروا خەڵك وێڵ ناکات و خەڵکی دوای عوثمان سەبارەت بەخەلیفەیەك کە بەسەریاندا دابنرێ راجیادەبوون، هیچ کەسیش نەبوو دوای ئەو سێ خەلیفەیە هێندەی چوارم خەلیفە-واتە عەلی- بەڕێزتر و زاناتر و لەخواترستر و ئاییندارتر بێت، بۆیە بەیعەتی پێدرا، ئەگەریش بەو خێراییە بەیعەت نەدرایە بە عەلی ئەوا وێڵ و لاسارەکان بارەکەیان زۆر خراپتر دەکرد، بەڵام کۆچەران و پشتیوانان بڕیاری خیلافەتیان دا بۆ عەلی، ئەویش ئەوەی لەسەر خۆی بە فەرز زانی، بۆیە ملکەچی بوو.

طەلحە بەیعەتی دا بە عەلی، خەڵکیش وتیان دەستێکی ناتەبا بەیعەتی داوە بە عەلی، سوێند بەخوا ئەم مەسەلەیە ناگاتە جێی مەبەست، جا ئەگەر بوترێت ئەو دوانە-طەلحەو زوبەیر- بە

نارەزایی بەیعەتیان داوە –بە عەلی- لە وەڵامدا دەڵێین هەرگیز شتی وا نەبووە بە ناحەزی بەیعەتیان دابێ و زۆریان لێ کرابێت، ئەگەریش تەنانەت بە نارەزایی بەیعەتیان دابێت ئەوە کاناکاتە سەر بەیعەتەکەی عەلی، چونکە بە یەك کەس یان دوان بەیعەت دەبەسترێت و سەردەگرێت، ئیتر هەرکەس دوای ئەوە بەیعەت بدات پەیوەستی ئەو بەیعەتە دەبێت، بەپێی شەرعیش پێویستە لەسەری ئەو بەیعەتە بدات، ئەگەریش ئەو دوانە بەیعەتیان نەدایە ئەوا ئەو کارە کاریگەری نەدەبوو بۆیان و کاریگەریشی نەدەبوو بۆ بەیعەتی پێشەوا-ی موسڵمانان-.

ئەوەش دەڵێت: دەستێکی ناتەباو کارێکی بە ئەنجام نەگەیشتووە، ئەوە گومانی کەسێکە کە دەڵێت طەلحە یەکەم کەس بووە بەیعەتی داوە، مەسەلەکەش وا نەبووە-طەلحە یەکەم کەس نەبووە بەیعەتی دابێت بە عەلی-.

ئەگەریش بوترێت موسڵمانان لەسەر ئەوە بەیعەتیان داوە بە عەلی کە بکوژانی عوثمان بکوژێتەوە ئەوا دەڵێین ئەو مەرجە

بۆ بەیعەت راست نیە، بەڵکو لەسەر ئەوە بەیعەتی پێدەدەن کە حوکم بە حەق بکات، ئەویش ئەوەیە کەسی داواکاری خوێنی عوثمان ئامادە بێت و کەسی داواکراویش ئامادە بێت و سکاڵآ بکرێت و وەڵام بدرێتەوەو بەڵگە بەردەست بێت و حوکم بدرێت، بەڵام ئەوەی هەر بە قسەیەکی رەها یان کارێکی بەدواداچوون بۆ نەکراو یان بیستنی قسەیەك هێرش ببات ئەوە لە ئاینی ئیسلامدا شتی وا نیە.

عوثمانیەکان دەڵێن: دەستەیەك لە هاوەڵان لە بەیعەتدانی دواکەوتن، لەوانە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و مەحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئیبن عومەر و ئوسامەی کوڕی زەید و چەند هاوشێوەیەکی تری ئەوان.

ئێمەش دەڵێین سەبارەت بە بەیعەتپێدانی دوانەکەوتون، بەڵام سەبارەت بە سەرخستنی دەستەیەك لەوانەی کە باسکران دواکەوتن، چونکە ئەو مەسەلەیە مەسەلەیەکی ئیجتیهادی بوو، هەر کام و ئیجتیهادێکیان هەبوو و بەپێی روانینی خۆی هەنگاوی دەنا و قەدەری خۆی دەهاتەرێ.

دەستەیەك دەگێڕنەوە کاتێك بەیعەت درا بە عەلی، طەلحەو زوبەیر داوای مۆڵەتیان لە عەلی کرد تا بچن بۆ مەککە، عەلی بەوانی وت لەوانەیە بتانەوێت بچن بۆ بەصرەو شام، ئەوانیش سوێندیان خوارد وا ناکەن.

## رێككەوتن لە مەككە

لە مەككە سێ رای جیاواز دروست بوو، دەستەیەك وتیان با بچین بۆ لای موعاویە بۆ شام و لەوێوە بێین تۆڵە بكەینەوە، دەستەی دووەم وتیان بەڵكو با بچین بۆ مەدینە بۆ لای عەلی و داوای تۆڵەی عوثمان بكەینەوە، دەستەی سێیەم وتیان بەڵكو دەچین بۆ بەصرەو لەوێ خۆمان بەهێز دەكەین و هەر لەوێوە دەكەوینە لەناوبردنی بكوژانی عوثمان، ئەوەبوو لەسەر ئەم رایە رێككەوتن.

(سەبارەت بە چوونی –هاوەڵانی عائیشەو طەلحەو زوبەیر- بەرەو بەصرە راستەو هیچ كێشەیەكی لەسەر نیە، بەڵام بۆچی دەرچوون؟ لەمەدا گێڕانەوەیەكی لەسەر نیەو متمانە بە هیچ گێرانەوەیەكیان ناكرێت چونكە كەسی جێمتمانە نەیگێڕوانەتەوە، قسەی كەسی هەوادار وەرناگیرێت، حەزی تانەدان لە ئیسلام و بەكەمدانانی هاوەڵان چووەتە ناخی كەسی هەوادار و دەمارگیر.

لەوانەیە بۆ ئەوە دەرچووبن تا لەبەر شتێك كە بۆیان دەركەوتووە ویستبێتیان عەلی –لە خیلافەت- لاببەن، بۆیەش بەیعەتیان دابێت تا شۆڕشگێڕەكان هێور ببنەوە، دواتر كەوتبنە داوای حەق.

لەوانەشە بۆیە چووبنە دەرەوە تا بكوژانی عوثمان لەناوبەرن.

لەوانەشە بە چەند دەستەیەكی موسڵمانانەوە دەرچووبن تا بیانگێڕنەوە بۆ یەك قانوون تا بەریەكنەكەون و دژ بەیەك نەجەنگن، ئەمەش دروستە نەك شتی تر، هەواڵی راستیش بەم جۆرە هاتووە.

سەبارەت بە گێڕانەوەكانی بەشەكانی یەكەم هەموویان پووچ و لاوازن.

سەبارەت بەوەی ئەوان بە زۆر و ناچاری بەیعەتیان دابێت ئەوە بێبنەما و پووچەو پێشتریش روونمان كردوەتەوە.

سەبارەت بەوەی ویستبێتیان عەلی لە خیلافەت لابەن ئەمەش بێ بنەما و پووچە، چونکە لابردن بە راو روانینی هەمووان دەبێت، دەکرێت یەك یان دوو کەس لە دەسەڵاتدا بن، بەڵام لابردن تەنها دوای سەلماندن و روونکردنەوە دەبێت.

سەبارەت بەوەش کە لەوانەیە بۆ کوشتنی بکوژانی عوثمان دەرچووبن، پێش ئەمە کارەکە بنەرەتەکەی بۆ یەکدەنگی بووە، دەشکرێت هەردوو مەسەلەکە پێکەوە بن.

دەگێردرێتەوە لە کاتی ئامادەنەبوونی-طەلحە و زوبەیر و عائیشە لە مەدینەدا- ئاژاوەی نێوان خەڵك نەما، طەلحە و زوبەیر و عائیشەش دایکی باوەڕدارانیش بەو هیوایە چوونەدەرەوە تا خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای دایکیان و رەچاوی حورمەتی پێغەمبەرەکەیان بکەن).

کە گەیشتنە بەصرە بەرپرسی ئەوێ نوێنەری نارد تا بزانێت بۆچی هاتون، چوونە لای عائیشە وتیان بۆچی هاتویت؟ وتی بۆ داوای خوێنی عوثمان هاتوین، چوونە لای طەلحە، ئەویش

هەمان شتی وت، چوونە لای زوبەیریش ئەویش هەمان شتی وت.

بەڵام سوپاکەی عوثمانی کوڕی حنیف بەوە رازی نەبوون و هەوڵیاندەدا لەگەڵ سوپای عائیشە بجەنگن، عائیشەش فەرمانی کرد کەس جەنگ نەکات، رۆژێك خۆیان پاراست، بەڵام لە رۆژی دووەمدا جەنگ روویدا و ژمارەیەك لە هاوەڵان و کەسانی تر کوژران.

دواتر بڕیاریان دا هەواڵ وەربگرن ئەگەر طەلحەو زوبەیر بە ناچاری بەیعەتیان دابوو ئەوە عوثمان بەصرەیان بۆ چۆڵ بکات، ئەگەریش بە ویستی خۆیان بووبێت ئەوە ئەو دوانە دەبێت بەصرە چۆڵ بکەن، نوێنەریان ناردە مەدینەو نوێنەر هەواڵی پرسی، کەس وەڵامی نەدەدایەوە جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە وتی بەخوا بە ناچاری بەیعەتیان دا، کەچی خەڵکانێك هەڵمەتیان بۆ برد، چەند هاوەڵێك رزگاریان کرد، بارەکە نەگەیشتە ئەنجام.

لە بەصرە جەنگ روویداو ژمارەیەکی تر کوژران و عوثمان بەدیل گیرا و برا بۆ لای عائیشە، ئەویش داوای کرد ئازاد بکرێت، بەڵام شار کەوتە دەست سوپای عائیشە.

عەلی کوڕی ئەبوو طالیب کە ئەمەی بیست بڕیاریدا بچێت بەرەو بەصرە، خەڵکێکی کەمی مەدینەی لەگەڵ بوو، ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەشداربووی غەزای بەدری لەگەڵدا بوو، ژمارەی سوپاکەی عەلی تەنها نۆسەد کەس بوو، حەسەنی کوڕی داوای لێکرد نەچێت، عەبدوڵای کوڕی سەلامیش هەمان داوای لێکرد، بەڵام عەلی رازی نەبوو، ئینجا هەواڵی نارد بۆ کووفە تا بدەنە پاڵی، بەرەبەرە سوپاکەی عەلی روی لە زیاد بوون بوو.

عەلی کە عوثمانی کوڕی حنیفی بینی و هەواڵی کارەکانی طەلحەو زوبەیری بیست، نزای کرد خوایە طەلحەو زوبەیر بەرامبەر بەو هەڵەی کردوویانە بێدار بکەیتەوە.

کاتێك زوبەیر لە بەصرە بوو کەسێك هات بۆ لای و وتی ئەرێ بچم عەلی بکوژم؟ ئەویش وتی چۆن دەیکوژیت لەکاتێکدا سەربازی زۆری لەگەڵدایە؟ ئەویش وتی دەچمە ناو سوپاکەی و خۆمی لێ نزیك دەکەمەوەو دواتر دەرفەتی لێ دێنم، زوبەیر وتی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (الإيمان قيد الفتك، لا يفتك مؤمن)، (ئیمان نامەرد کوژی کۆت کردووە، باوەڕدار نامەردکوژی ناکات).

دواجار قەعقاع کەوتە نێوانەوە، چوویە بەصرەو طەلحەو زوبەیری بانگهێشت کرد بۆ یەکڕیزی و دوورگرتن لە دووبەرەکی، سەرەتا لەگەڵ عائیشە قسەی کرد و وتی دایە گیان بۆچی هاتوویتەتە ئێرە؟ ئەویش وتی کوڕی شیرینم بۆ ڕێکککردنی باری نێوان خەڵك، ئینجا قەعقاع داوای کرد طەلحەو زوبەیریش بانگ بکات، ئەوانیش هاتن قەعقاع وتی دایکی باوەڕداران دەڵێت بۆ صولح هاتوم، ئەوانیش وتیان ئێمەش بەس بۆ ئەوە هاتوین، ئەویش وتی دەی پێم بڵێن ئەو

صولحەتان لە چ روانگەیەکەوەیە؟ ئەگەر بە رەوامان زانی شوێنتان دەکەوین، ئەگەریش بە رەوامان نەزانی ئیتر هیچ، ئەوانیش وتیان بکوژانی عوثمانمان دەوێن لەناوببرێن، قەعقاع وتی خۆ ئێوە بکوژانی ئەوتان لە بەصرە کوشت، شەش سەد کەستان کوشت شەش هەزار کەس چوونە ریزی ئەوانەوەو دژتان وەستان، داوای تەنها کەسێکتان کرد کە حرقووص بوو شەش هەزار کەس بوونە پارێزەری، ئەمەی ئێوە داوای دەکەن بۆ چاکەیە، بەڵام خراپەیەکی زۆر گەورەی لێدەکەوێتەوە، عائیشە وتی ئەی تۆ چ چارەسەرێکت پێیە؟ قەعقاع وتی من پێم وایە دەرمانی ئەم دەردە ئارامگرتنە تا بارەکە هێور دەبێتەوە، ئەمە بکەن خێر و رەحمەت دێت، ئەگەریش رازی نەبن باری خراپە زیاتر دەبێت بۆ هەردوو لامان، ئەوانیش وتینا دەی بۆچوونەکەت زۆ دروستە، بڕۆ ئەگەر عەلیش هەمان رای هەبوو رازی دەبین، ئەویش چوویەوە بینی عەلی هەمان رای هەیە، ئیتر هەردوولا رێککەوتن، عائیشەش نوێنەری نارد بۆ

لای عەلی تا پێی بڵێت ئەو تەنها بۆ صولح هاتووە، هەردوولا دڵخۆش بوون و عەلیش وتارێکی پێشکەش کرد بۆ خەڵکەکە کە تیایدا باسی خراپەی دووبەرەکی کرد و نیازی ڕێککەوتنەکەی خستەڕوو.

کاتێك لە وتارەکەی عەلیەوە دەستەی ئاژاوەگێڕان زانییان خەریکە ڕێکدەکەون، کەوتنە خۆ، لەوانە ئەشتەری نەخەعی و عەبدوڵای کوڕی سەبە و شریح و سالم و چەندێکی تر کە هیچ هاوەڵێکیان تێدا نەبوو نزیکەی دوو هەزار و پێنج سەد کەسێك دەبوون کەوتنەخۆ و وتیان ئەم ڕێککەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان کەمە و ڕێککەوتنی ئەوان تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت عەلیش وەك عوثمان لێبکەین، خەڵکەکەش ڕازی بوون، بەڵام عەبدوڵای کوڕی سەبە وتی ڕاکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵگیرسێنین، کاتێك زوبەیر و طەلحە چوون بۆ لای عەلی تا

ڕێکبکەون، دەستەی سەبەئیەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولادا و جەنگیان هەڵگیرساند، هەردوولا وایانزانی بەرامبەر ناپاکی نواندووە، بۆیە کەوتنە هێرش، سوپای عەلی نزیکەی بیست هەزار کەس و سوپای عائیشەش نیکەی سی هەزار کەس دەبوون، جەنگێکی قورس ڕوویدا، عەلی هاواری دەکرد دەست هەڵگرن، بەڵام کەس نەیدەبیست، لەولاشەوە عائیشە بە سواری وشترێکەوە بۆ هەمان نیاز هات، عەلی هێندە بێزار بوو بە حەسەنی کوڕی دەوت کوڕم خۆزگە باوکت بیست ساڵ لەمەوبەر دەمرد، عەلی چو تا زوبەیر و طەلحە بدوێنێت، وتی ئەم سوپایەتان ئامادە کردووە، بیانووشتان بۆ قیامەتتان ئامادە کردووە؟ دەی لەخوا بترسن، من خوێنی ئێوەم حەڵاڵ نەکردووە، ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێیە بۆ ڕەوایی خوێنی من؟

## کوژرانی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا

دواتر کە جەنگی جەمەل روویدا، عەلی کوڕی ئەبووطالیب طەلحەی دواند و هەندێ لەو قسانەی پێ وت کە بە زوبەیری وتبوو، طەلحەش کەناری گرت لە جەنگەکەو دواتر تیرێکی بەرکەوت و کوژرا،_مەڕوانی کوڕی حەکەم طەلحەی کردە چاو، چونکە ئەوی بە بکوژی عوثمانی کوڕی عەففان دەزانی و دەیوت ئەمە پشتیوانی نەیارانی عوثمان بوو، بۆیە تیرێکی تێگرت و دای لە ئەژنۆی، بەردەوام خوێنی لێدەچوو تا کوشتی، ئەمەش لە رۆژی پێنج شەممە و دەی جومادیلئوولای ساڵی سی و شەشی کۆچیدا بوو، ئەو کات تەمەنی نزیکەی شەست و چوار ساڵ دەبوو.

کاتێك عەلی تەرمەکەی طەلحەی بینی، خۆڵی سەر دەموچاوی دەتەکاند و رەحمەتی بۆ دەنارد و دەیوت خۆزگە بیست ساڵ لەمەوبەر بمردمایە، خۆی و هاوەڵانی لەسەر تەرمی طەلحە دەگریان.

## کوژرانی زوبەیری کوڕی عەووام

عەلی بە زوبەیری وت سوێندت دەدەم بە خوا تۆ گوێت لە پێغەمبەر ﷺ نەبوو کە پێی دەفەرمووویت تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگێیت و تۆیش ستەمی لێدەکەیت؟ ئەویش وتی بەڵێ، بەڵام ئەوە ئێستا ئەو فەرموودەیەم بیردەکەوێتەوە، بۆیە کەناری گرت.

ئینجا بە سوارەکەیەوە بە ناو ریزەکاندا دەگەڕایەوە، عەبدوڵای کوڕی وتی باوکە چیتە؟ زوبەیر وتی عەلی فەرموودەیەکی بۆ باسکردم کە من خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستبوو پێی فەرمووم (تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگیت و ستەمیشی لێ دەکەیت)، بۆیە لەگەڵی ناجەنگم، عەبدوڵا وتی بۆچی بۆ جەنگ هاتبوویت؟ تۆ هاتبوویت تا نێوانی خەڵکەکە ڕێکبخەیت و خوا بە هۆی تۆوە ئەم بارە ڕێکبخات، زوبەیر وتی سوێندم خواردووە جەنگ نەکەم، عەبدوڵا وتی دەی جیرجیسی کۆیلەت ئازاد بکەو بوەستە تا نێوانی خەڵك ڕێکبخەت، ئەویش کۆیلەکەی ئازاد

کرد و راوەستا، بەڵام خەڵکەکە جیاوازی زیاتری تێکەوت، بۆیە بە ئەسپەکەیەوە چوو.

زوبەیر کە چوو دای بە لای سەربازگەکەی ئەحنەفدا، ئەویش وتی کێ دەچێت هەواڵێکی ئەمەم بۆ وەربگرێت، ئیبن جرمووز وتی من، ئەوەبوو کەوتە شوێن زوبەیر، کە گەیشت بە زوبەیر، زوبەیر زۆر توورە بوو، وتی چیتە؟ ئیشت چیە؟ وتی هاتوم تا پرسیارێکت لێ بکەم، عەطیە کە خزمەتکارێکی زوبەیر بوو و لەگەڵ زوبەیر بوو وتی ئەو چەکی پێیە، بەڵام زوبەیر گوێی پێ نەدا، ئیبن جرمووز وتی کاتی نوێژە، ئەوەبوو دابەزین تا نوێژ بکەن، کەچی ئیبن جرمووز خۆی خستە پشتی زوبەیر و لە پشتەوە کەلەبەری زرێپۆشەکەی کردە ئامانج و دای لە زوبەیر و کوشتی و ئەسپ و چەکەکەشی برد، دواتریش وازی لە خزمەتکارەکەی هێنا، خزمەتکارەکەشی تەرمی زوبەیری ئەسپەردە کرد و دواتر چوو هەواڵەکەی بردەوە بۆ خەڵکەکە.

ئیبن عەبباس دەڵێت لە جەنگی جەمەلدا بە زوبەیرم وت ئەری هاتویت لەگەڵ کوڕی عەبدولموتەلیبدا بجەنگیت؟ ئیتر زوبەیر گەڕایەوە، کەچی ئەوەبوو ئیبن جرمووز خۆی گەیاند پێی و کوشتی، دواترئیبن عەبباس هات و پرسیاری کرد لە عەلی ئەری بکوژەکەی زوبەیر سەرەنجامی بەرەو کوێیە؟ عەلی وتی دۆزەخ.

## جەنگی صفین

لە ساڵی سی و حەوتی کۆچیدا پاش ئەوەی موعاویە ئامادە نەبوو بەیعەت بدات بە عەلی و نەگەیشتە ئەنجام، هەردوو لا لە سوپای عەلی و موعاویە لە ناوچەیەك کە پێی دەوترا صفین بەرامبەر یەك وەستانەوە، ماوەی چەند رۆژێك رۆژانە دەجەنگان، جار هەبوو کەمێك و جاریش هەبوو دوو جار لە رۆژێکدا سووکە جەنگێك دەکرا، هەرچەندە هەوڵ درا بگەنە ئەنجامێك، بەڵام دواجار جەنگێکی سەخت لەنێوان هەردوولادا روویدا و تیایدا ژمارەیەکی بەرچاو لە هەردو ولا کوژران، کاتێك خەریك بوو دەستەی عەلی سەرکەون، خەڵکی شام قورئانیان بەرز کردەوەو داوایان کرد هەردوو لا بگەڕێنەوە بۆ بڕیاری قورئان، ئەوانیش رازی بوون و بەوە جەنگەکە کۆتایی هات.

## هەڵوێستی هاوەڵان بەرامبەر بە ئیجتیهادەکەی عەلی

هەڵوێستی هاوەڵان سەبارەت بە ئیجتیهادی عەلی بۆ چارەسەری پرسی شەهیدکردنی عوثمان خۆی لە سێ دەستەدا دەبینیەوە:

دەستەی یەکەم: بڕوایان وابوو دەبێت خێرا تۆڵەی خوێنی عوثمان بکرێتەوە تا نەبێتە مۆدێل و هەرکات دەستەیەك ویستیان هەستن خەلیفە بکوژن، بەتایبەت کوشتنی کەسێکی وەك عوثمانی کوڕی عەففان، بۆ ئەمەش پێشتر نموونەی طه لحەو زوبەیر و عائیشەو موعاویەو عەمر و چەندێکی ترمان خستەڕوو کە تەنانە تا ڕوودانی جەنگی نێوان دوو دەستەی موسڵمانانیش لەسەر مەسەلەکە ڕۆیشتن و ئەو فیتنە گەورەی لێکەوتەوە کە ڕوویدا.

دەستەی دووەم: ئەوانەی هاورای عەلی بوون و دەیانوت با جارێك بارەکە هێور بێتەوە ئینجا تۆڵە لە بکوژانی عوثمان بکرێتەوەو ئەوانەش بەشێکی دیاری ناو هاوەڵان بوون کە لە زنجیرەی ژیانی هاوەڵاندا لە باسی هەرکامیاندا ئاماژەمان بەوانە داوە کە هاورای عەلی بوون و لەناو سوپاکەیدا بەشداری جەمەل و صفین بوون.

دەستەی سێیەم: ئەوانە بوون کە بەریەککەوتنی ئەو دوو ئیجتیهادەیان بینی زانییان چ فیتنەیەکی لێدەکەوێتەوە، بۆیە کەناریان گرت لە هەردوو ئیجتیهادەکەو هیچ بەشداریەکیان نەبوو، بۆ نموونە:

ئیبن عومەر لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری هیچ جەنگێکی نەکرد و و کەناری گرت، بەڵام دواتر لە دواییەکانی تەمەنیدا پەشیمانی دەردەبڕی کە چۆن پشتیوانی عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نەکرد لەو جەنگانەدا.

کاتێك عەلی کوڕی ئەبووطالیب ویستی جەنگی شام بکات، چوو بۆ لای ئیبن عومەر و هانی دا تا لەگەڵیدا بەشداری بکات، ئیبن عومەر وتی منیش وەك ئەو خەڵکەی ترم، بەڵام بۆ جەنگ ئەم ساڵ ئامادە نیم بەشداری بکەم، دواتر ئیبن عومەر خۆی ئامادە کرد و چوو بەرەو مەککە.

جا پێش ئەوەی بچێت بۆ مەککە، عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو بە کەفیلی ئیبن عومەر کە دژی ناوەستێت، دواتر ئیبن عومەر چوو بۆ لای ئوموکلثومی کچی عەلی کە ژنی عومەری کوڕی خەططاب بوو و پێی وت کە دەچێت بۆ عومرە، هەروەها وتی من تەواو گوێڕایەڵی عەلیم جگە لە فەرمان کردنی بە جەنگ و راپەڕین، دواتر وا هەواڵ برا بۆ عەلی وتیان ئەمشەو بارێکی سەختتر لەوەی عائیشەو طەلحەو زوبەیرو موعاویە روویداوە، وتی چی بووە؟ وتیان ئیبن عومەر چووە بۆشام، ئیتر بار شلەژا، کە ئوموکلثوم ئەوەی بیست، هات بۆ لای عەلی و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد،

عەلیش دەروونی ئارام بوویەوەو وتی بڕۆن بەخوا نە من بەدرۆ کەوتمەوەو نە ئەو درۆی کرد، بەخوا من متمانەم زۆرە پێی.

حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری بڕیاری دا کەنار بگرێت لەو فیتنەی پەیدا بووە، ئەوەبوو کاتێك عەلی کوڕی ئەبوو طالیب نێردراوێکی نارد بۆ لای، نێردراوەکە وتی ئەمیری باوەڕداران پێت دەڵێت تۆ لە هەموان شیاوتری تا لەسەر ئەم مەسەلە هاوکارمان بیت، حەکەمیش لە وەڵامی خەلیفەدا وتی دەی ئەی ئەمیری باوەڕداران من لە خۆشەویستم بیستووە کە ئامۆزای تۆیە دەیفەرموو (ئەگەر باری وا هات شمشێرێکی تەختە دروست بکە).

خوزەیمەی کوڕی ثابت لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا بەشداری نەکرد، بەڵکو شمشێرەکەی لە کالان نابوو، ئەوەبوو لە جەمەلدا هەرچەندە ئامادە بوو بەڵام شمشێری لە کالان دەرنەکرد، بەڵام کاتێك لە جەنگی صفیندا بینی عەمماری کوڕی یاسر کوژرا، ئەو دەیوت جەنگ ناکەم تا بزانم کێ عەممار دەکوژێت،

هەرکەس کوشتی ئەوکات دەجەنگم، چونکە بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو دەستەی باغی و سەرکەش عەمار دەکوژن، ئیتر کە عەمار کوژرا خوزەیمە وتی وا گومڕایی و نەپێکانم بۆ روون بوویەوە، شمشێری لە کالان دەرکردو جەنگا تا کوژرا،ـواتە خوزەیمە حوکمی عەلی پێ رەوا و دروست بوو و لەناو ریزی سوپای ئەودا مایەوەو کوژرا.

رایەکی تری جیاوازو تایبەت رای حەسەنی کوڕی بوو، کە لەلایەکەوە هەوڵی راگرتنی جەنگەکانی باوکی دەدا و لەلایەکی تریشەوە لە مەیدانەکەدا تەنها جێی نەدەهێشت.

حەسەنی کوڕی عەلی بەیعەتی دا بە عەلی باوکی و لەگەڵیدا مایەوە، کاتێك سەربازگەکەی عەلی لە رەبذە بوو تا بچن بۆ جەنگی دژ بە طەلحەو زوبەیر، پاش ئەوەی نوێژیان کرد، حەسەن چوو بۆ لای عەلی باوکی و لەلای دانیشت و وتوێژێکی لەگەڵ باوکیدا کرد، حەسەن وتی باوکە من شتێکم پێ وتیت و تۆیش لە قسەم دەرچوویت، سبەی بێ کەس

دەکوژرێیت و کەس پشتت ناگرێ، عەلیش پێی وت تۆ هێشتا لووشکەلووشکی کچانت هەیە، چیت پێ وتم و من بەگوێم نەکردیت؟ حەسەن وتی ئەو رۆژەی گەمارۆی ماڵی عوثمان درا داوام لێکردیت لە مەدینە بچیتە دەرەوە تا کاتێك عوثمان کوژرا تۆ لەناو مەدینەدا نەبیت، پاشان ئەو رۆژەی عوثمان کوژرا پێم وتیت بەیعەت لەکەس وەرنەگریت تا وەفدی خەڵکی ناوچەکان و عەرەب و بەیعەتی هەموو میصرت بۆ بێت، پاشان کاتێك ئەو دوانە بەزمی خۆیان کرد پێم وتیت  لە ماڵی خۆتدا بمێنیتەوە تا رێکدەکەون، ئەگەر خراپەی لێکەوتەوە ئەوە تۆی بەرنەدەکەوت، کەچی لە هەموو ئەمانەدا تۆ پێچەوانەی من جووڵایتەوە، عەلیش وتی: کوڕی ئازیزم، سەبارەت بە دەرچوونم لە مەدینە کاتێك عوثمان گەمارۆ درابوو، دەی سوێند بەخوا وەك چۆن ئەو گەمارۆ درابوو منیش گەمارۆ درابووم، سەبارەت بەوەی بەیعەت وەرنەگرم تا هەموو ناوچەکان بێن و بەیعەت بدەن، دەسەڵاتەکە هی مەدینە بوو و پێیان باش نەبوو

ئەو دەسەلآتە بفەوتێت، سەبارەت بە دەرچوونی طەلحەو زوبەیریش ئەوە کەموکورتی و ترسنۆکی بوو بۆ موسڵمانان، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی دەسەلآتم وەرگرتووە پشتم بەردراوە و ئەوەی پێویست بووە نەهاتووەتە رێم، سەبارەت بەوەی لە ماڵەوە دابنیشتایەم، ئەی چیم بکردایە بەوەی دەهات بۆ لام، تۆ ئەتویست من چۆن بم؟ دەتویست وەك ئەو جرجە بوومایە کە گەمارۆ دەدرێت دباب دبابیەتی-بانگکردنی نێوان جرجەکان-.

بەڵام حەسەن کە ئەمانەی دەوت بە باوکی، هاوکات ئامادەیی هەبوو هەموو پشتگیریەکی باوکی بکات وەك خەلیفەیەك کە بەیعەتی پێدابوو، بۆیە کاتێك عەلی داوای کرد خەڵکی کووفە بێنە ناو ریزی سوپاکەی و ئەبوومووسای ئەشعەریش خەڵکەکەی سارد دەکردەوە تا نەچن چونکە ئەوەی بە فیتنەیەك دەزانی، عەلی چەند کەسێکی نارد تا خەڵکەکە رازی بکەن بێنە ناو سوپاکەی، بەڵام هیچکام ئەوەیان پێ نەکرا، دواجار عەلی حەسەنی کوڕی نارد لەگەڵ عەمماردا، ئەوەبوو حەسەن وعەلی

چوونە مزگەوتی کوفەو لەوێ ئەبوو مووسا کە حەسەنی بینی باوەشی پێداکرد، حەسەن وتی ئەی ئەبوو مووسا بۆچی خەڵکمان لێدەتەکێنیتەوە، سوێند بەخوا ئێمە تەنها خێرمان دەوێت و کەسی وەك ئەمیری باوەڕدارانیش لەهیچ ناترسێت، ئەبووموسا وتی بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم راست دەکەیت، بەڵام راوێژپێکراو دەبێت سپاردەکار بێت، من بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو (فیتنەیەك روودەدات کە ئەوەی تیایدا دانیشتووە زۆر باشترە لەوەی تیایدا راوەستاوە، ئەوەی تیایدا راوەستاوە زۆر باشترە لەوەی تیایدا رێ دەکات، ئەوەی تیایدا رێ دەکات زۆر باشترە لەوەی تیایدا سوارە) خوا ئێمەی کردوەتە برای یەك و ماڵ و خوێنی لەیەك حەرام کردوین، ئینجا چەند ئایەتێکی خوێندەوە، عەممار کە لەگەڵ حەسەن بوو تووڕە بوو و هەستا و کەوتە قسەکردن لەناو خەڵکەکەدا، هەندێکیش وەڵامیان دایەوە...

حەسەن دواتر قسەی بۆ خەڵکەکە کرد و وتی ئەی خەڵکینە بێن بەدەم بانگەوازی ئەمیرەکەتانەوەو بچن بۆ لای براکانتان، چونکە هەموو کەسێ دەبێت بچێت بەدەم ئەم بانگەوازەوە، سوێند بەخوا ئەگەر کەسانی ژێر ئەم بارە بگرنە دەست زۆر لەپێشتر و باشترە بۆ داهاتووش، دەی وەرن بەدەم بانگەوازەکەمانەوەو لەو بارەدا کە ئێمەو ئێوەش پێی تاقی دەکرێینەوە هاریکارمان بن، بەوە خەڵکەکە رازی بوون.

## مەسەلەی دادوەری

کاتێك عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان ڕێککەوتن لەسەر دانانی دوو دادوەر بۆ چارەسەری کێشەی نێوانیان و پێدانی دەسەڵآتی تەواو پێیان تا بڕیاری کۆتایی بدەن، موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان عەمری کوڕی عاصی ڕاسپارد، عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش ئەبوو مووسای ئەشعەری ڕاسپارد، هەرچەندە داوای لێکرا کە ئیبن عەبباس بکات بە دادوەر، بەڵام لەلایەکەوە لەبەر فشاری یەمانیەکان و لە لایەکی تریشەوە لەبەر زانینی پلەوپایەی ئەبوو مووسا خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووطالیب ئەبوو مووسای بۆ ئەو ئەرکە ڕاسپارد، خەلیفە بە ئەبوو مووسا و عەمری کوڕی عاصیشی وت لەسەر بنەمای قورئان حوکم بدەن، قورئانیش پشتیوانی منە، ئەگەر بەپێی قورئان حوکم نەدەن بڕیارتان بۆ نیە.

لێرەدا گێڕانەوەیەکی باو و بڵاو سەبارەت بە دادوەریەکە هەیە کە زۆرێك لە سەرچاوەکان هێناویانەو کردوویانە بە بەڵگەیەك بۆ تانەدان لە هەریەك لە ئەبوو مووسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص، دەستەیەکیش وەڵامی ئەو گێڕانەوەیان داوەتەوە، بە کورتی هەردوو راکە دەخەینەڕوو:

ئەبوو موخنەف دەڵێت ئەبووجونابی کەلبی بۆی گێڕامەوە کاتێك عەمر و ئەبوو مووسا لە دەومەتولجەندەل کۆبوونەوە، عەمر پێش ئەبوو مووسا قسەی کرد و وتی تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوایت و لە من بەتەمەنتریت، تۆ قسە بکەو منیش دواتر قسە دەکەم، لە هەموو شتێکدا عەمر ئەبوو مووسای پێشدەخست و بەوە خەڵەتاندی تا پێشتر ئەو عەلی کەنار بخات، عەمر دواتر ویستی موعاویە بهێڵێتەوە، بەڵام ئەبوو مووسا رازی نەبوو، ئینجا ویستی کوڕەکەی خۆی دابنێت، بەڵام رازی نەبوو، ئەبوو مووسایش ویستی عەبدوڵای کوڕی عومەر دابنێن، بەڵام عەمر رازی نەبوو، عەمر وتی رای خۆتم

پێ بڵێ، ئەبوو مووسا وتی رام وایە ئەم دوو پیاوە(عەلی و موعاویە) لا ببەین و مەسەلەکە بکەین بە شوورای نێوان موسڵمانان و موسڵمانان خۆیان بە حەزی خۆیان کەسێك هەڵبژێرن، عەمر وتی منیش هاورِای تۆم، ئەوەبوو چوون بۆ لای خەڵکەکەو ئەبوو مووسا پێشتر قسەی کرد و وتی رای من و عەمر لەسەر یەك شتە کە هیوامان وایە خوای گەورە بەو هۆیەوە باری ئەم ئوممەتە رێك بخات، عەمر وتی ئەبوو مووسا راست دەڵێت، ئەبوومووسای پێشخست، ئیبن عەبباس بە ئەبوومووسای وت ماڵوێران وادەزانم لەخشتەت دەبات، ئەگەر ئێوە لەسەر شتێك رێککەوتون دەی تۆ ئەو پێش بخە با ئەو قسەکەی بکات ئینجا تۆ قسە بکە، چونکە عەمر کەسێکی ناپاکە.

ئەبوومووسا سادە بوو و پێی وت ئێمە رێککەوتوین بۆیە پێشکەوت و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر وتی ئەی خەڵکینە ئێمە تەماشای باری ئەم ئوممەتەمان کرد و باشترین

شت بۆ ئەوە کە رای من و عەمری لەسەرە ئەوەیە عەلی و موعاویە لابەرین و ئەم ئوممەتە رووبکەنە مەسەلەکەو خۆیان بە حەزی خۆیان کەسێك بکەنە ئەمیر، وا من عەلی و موعاویەشم لابرد و ئێوە خۆتان کەسێك بکەن بە ئەمیر کە بە باشی دەزانن، دواتر ئەبوو مووسا کەناری گرت و عەمری کوڕی عاص هەستا و هاتە شوێنەکەی و سوپاس و ستایشی خوای کرد و وتی قسەکانی ئەوتان بیست کە هاوەڵەکەی خۆی لابرد، منیش وەك ئەو هاوەڵەکەی خۆی لادەبەم و موعاویەی هاوەڵم دەهێڵمەوە، چونکە ئەو وەلی عوثمانی کوڕی عەففانەو داواکاری خوێنی ئەوە و شیاوترین کەسە بە شوێنەکەی، ئەبوو مووسا وتی چیتە خوا مۆفەقت نەکات ناپاکیت نواند و لاتدا، نموونەی تۆ وەك سەگ وایە، عەمریش وتی نموونەی تۆیش وەك کەر وایە، جا شورەیحی کوڕی هانی هەڵیکوتایە سەر عەمر و بە قامچی لێیدا، کوڕێکی عەمریش هەڵیکوتایە سەر شورەیح و بە قامچی لێیدا، خەڵکی هەستان و جیایان کردنەوە،

جا شورەیح دواتر دەیوت پەشیمانم لەوەی لە بری قامچیەکەم بە شمشێر نەمدا لە عەمر...

ئیبن عەبباسیش دەیوت خوا ئەبوو مووسا بێزراو بکات خۆ من هۆشیارم کردەوە کەچی وەرینەگرت...

جا عەمر و شامیەکان گەڕانەوە بۆ لای موعاویەو خیلافەتیان پێ سپارد و ئیبن عەبباس و شورەیحیش گەڕانەوە بۆ لای عەلی، جا کە نوێژی بەیانی دەکرد لە قنووتدا نزای دەکرد خوایە نەفرینت بنێرە بۆ موعاویەو عەمر و ئەبولئەعوەری سولەمی و حەبیب و عەبدوڕەحمانی کوڕی خالید و ضەحاکی کوڕی قەیس و وەلید، موعاویەش کە ئەوەی بیست لە هەموو قنووتێکدا دەستی دەکرد بە نەفرین کردنی عەلی و ئیبن عەبباس و ئەشتەر و حەسەن و حوسەین.

ئەم گێڕانەوەیە هی ئەبوو موخنەفە کە یەکێکە لەو شیعانەی زۆرترین گێڕانەوەی دژ بە هاوەڵان و ئەهلی سوننە تۆمار

کردووە، ناوەڕۆکی گێڕانەوەکەشی زۆر جێی گومانە و ئەم تۆمەتانەی لێدەکەوێتەوە:

یەکەم: بە گەمژەو نەفام دانانی ئەبوو مووسای ئەشعەری لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەوی نارد بۆ یەمەن و بەرپرسیارێتی پێ سپارد، هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ یەکێك بوو لەو چوار کەسەی کە فتوای دەدا، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططاب و عوثمانی کوڕی عەففانیشدا والی و بەرپرس بوو.

دووەم: بە ناپاك دانانی عەمری کوڕی عاص کە هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەری خوایە ﷺ و پێدانی سیفەتی ناپاکی پێی.

سێیەم: زمانی ئەبوو مووسا هی قسەوتنی وا ناشیرین نەبوو، زمانی عەمریش هەروا، هاوکات زمانی عەلی کوڕی ئەبووطالیب زمانی ئەو هەموو نەفرینە نیە لەو هەموو کەسە، ئەویش لەکاتی نوێژی بەیانیدا، هەروەك زمانی موعاویەش ئەو زمانە نەبوو.

چوارەم: ئەگەریش وابێت، خۆ مەرجی رازیبوون ئەوەیە هەردوولا لەسەر یەك وتە رێککەوتبن، خۆ ئەبوو مووسا وتی وا رێککەوتوین هەردووکیان لابەرین و وا من عەلی و موعاویەشم لابرد، بۆیە ئەگەریش عەمر وایکردبێت، ئەوە کارەکەی سەرکەوتوو نەبووە.

بۆیە ئەم گێڕانەوەیە زیاتر دەمارگیری توندی مەزهەبی شیعەی پێوە دیارەو زۆر دووبارەبوونەوەشی لە سەرچاوەکاندا تەنها لەم بنەڕەتەوەیە کە گێڕەرەوەکەی ئەبوو موخنەفی شیعەیە، خواش زاناترە بە راستیەکان.

سەبارەت بە گێڕانەوەی دووەم دەقی نووسینەکەی ئیبنولعەرەبی لە کتێبی (الصواصم من القواصم) دادەنێین سەبارەت بە مەسەلەی تەحکیم (دادوەری):

خەڵکی سەبارەت بە تەحکیم حوکمیان داوەو شتانێکیان وتووە کە خوا پێی رازی نیە، ئەگەر جیا لە ئاییندارییش بە چاوی پیاوەتی تەماشای بکەیت، تێدەگەیت لە نووسینەکاندا

بێهانایيەك هەيە كە زياتر بێدينيەو كەمترين شت بيلێين دەلێين نەفاميەكی روونە، ئەوەی لەو بارەوە راستە ئەوەيە كە پێشەوايانی وەك خەليفە ئيبن خەيياط و دارەقوطنی گێڕاويانەتەوە كە كاتێك دەستەی عێراقی بە سەد هەزار و دەستەی شامی بە حەفتا يان نەوەد هەزارەوە دەرچوون و لە صفين لای فورات دابەزين و لە رۆژی سێ شەممەو لە بەرەبەيانەوە جەنگان و خەڵكی عێراق سەركەوتن بەسەرياندا، دواتر رۆژی چوارشەممە لە حەوتی صەفەری ساڵی سی و حەوت هەمدی جەنگان تا ئەو كاتەی دوو كەس لە هەردوو لابڕياری دادوەرييان پێدرا، لە بەرەی عەليەوە پێنج شەممەو رۆژی هەينی و شەوی شەممە بوو، خەڵكی شام قورئانەكانيان بەرز كردنەوەو داوای رێككەوتنيان كرد و هەموان بلآوەيان لێكرد و لەسەر ئەوە رێككەوتن هەر دەستەيەك باری خۆی بداتە دەست كەسێك، ئەبوو مووسا لە بەرەی عەلی و عەمری كوڕی عاص لە بەرەی موعاويەوە، ئەبوو مووسا كەسێكی زۆر

خواناس و زانا و فیقهناس بوو، پێغەمبەر ﷺ هاودەم بە موعاذ ناردبووی بۆ یەمەن و عومەر پایەی پێدابوو و وەسفی تێگەیشتوویی کردووە، ئەو دەستە زبرە مێژوویيە وتەی ناراستە کە ئەبوو مووسا بە گەمژەو ڕا لاواز و هەڵخەڵەتاو لە قسەدا وەسف دەکات و ئیبنولعاصیش بە زیرەك و لێزانی وا وەسف دەکات کە بە نموونە باسکراوە و جەخت دەکەنەوە لەو ویستی خراپەی هەیبووەو هەندێ نەفامیش شوێن ئەو رایە کەوتوون و چیرۆك و شتانێکی وایان سەبارەت بە ئەو و هاوەڵانی تریش نووسیوە..

دەڵێن کاتێك ئەوان لە ئەذرەح لە دەومەتولجەندەل کۆبوونەوە و دانووستانیان کرد و ریککەوتن لەسەر ئەوەی هەردوو لا بەرپرسانیان لابەن، عەمر بە ئەبوومووسای وتووە تۆ پێشتر قسە بکە، ئەویش پێشکەوت و وتی من لە مەسەلەکە ورد بوومەوەو عەلیم لە پۆستەکەی لابرد و با موسڵمانان لەنێو خۆیاندا بڕیار بدەن وەك چۆن شمشێرەکەشم لە گەردنم لابرد،

ئەوەبوو لایبرد و لەسەر زەوی داینا، عەمریش هەستا و شمشێرەکەی خستە سەر زەوی و وتی من لە مەسەلەکە رامام و موعاویەم لە مەسەلەکەدا هێشتەوە و ئەم شمشێرەشم لە گەرنمدا دەهێڵمەوە، ئەبوو مووسا بەوە نارازی بوو و سەرکۆنەی کرد و عەمریش وتی وا رێککەوتین، خەڵکەکە بەو باری ناکۆکیە بلاوەیان لێکرد، ئەمە درۆیەکی راشکاوەو یەك پیتیشی لە راستیدا روونەداوەو داهێنەران و مێژوونووسانی پاشایان ئەمەیان داناوەو خەڵکێ کە بە ئاشکرا لە فەرمانی خوا دەردەچن و بیدعە دەنوێنن بە میراتی ئەو وتانەیان وەرگرتووە، ئەوەی چەسپاوەو زانایانی راستبێژ گێڕاویانەتەوە ئەوەیە کاتێك ئەو دوانە کۆبوونەوە تا لە مەسەلەکە رامێنن و دەستەیەکی رێزداری خەڵکیش ئامادە بوون لەوانە ئیبن عومەر و هاوچەشنانی، عەمریش موعاویەی کەنار خستووە، دارەقوطنی بە سەنەدی خۆی لە حوصەینی کوری مونذیرەوە هێناویەتی کاتێك عەمر موعاویەی کەنارخست، حوصەین چوو

لە نزیك چادرەکەی موعاویەوە چادری هەڵدا، موعاویە کە هەواڵی بیست ناردی بە شوێنیدا و وتی بیستوومە عەمر ئاواو ئاوای وتووەو کردووە، جا برۆ بزانە ئەوە چیە من لە بارەیەوە بیستوومە، حوصەین دەڵێت منیش چووم بۆ لای و وتم باسی ئەو کارەم بۆ بکە کە تۆ و ئەبو مووسا بۆی راسپێردراون چیتان کرد، ئەویش وتی خەڵکی قسەی خۆیان لەو بارەوە کرد، بەخوا بارەکە وەك ئەوەی ئەوان نەبوو، بەڵکو من بە ئەبوو مووسام وت رات لەم بارەیەوە چیە، ئەویش وتی من پێم وایە دەسەڵات بۆ یەکێك لەو کەسانە بێت کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد و لێیان رازی بوو، منیش وتم ئەی من و موعاویە چی لێدەکەیت؟ وتی پشتتان پێ ببەستێت چونکە ئێوە پشتیوانیتان لەدەست دێت، حوصەین چوویەوە بۆ لای موعاویەو بەسەرهاتەکەی وەك خۆی بۆ گێڕایەوە، ئەویش ناردی بۆ لای ئەبیلئەعوەری ذەکوانی و بە سوارەکانیەوە ناردی، ئەویش چوو سواری ئەسپەکەی بووو غاری دەدا و دەیوت کوا دوژمنی خوا؟

کوا ئەو فاسقە؟ عەمر چوو بۆ لای ئەسپێکی لەژێر چادرەکەیدا و بێ زین هێنایە دەرەوەو بەرەو لای چادرەکەی موعاویە غاری دەدا و دەیوت (إن الضجور قد تحتلب العلبة یا معاویة إن الضجور قد تحتلب العلبة) جار هەیە وشتری شیردەر سەتڵی شیرەکە پڕ دەکات ئەی موعاویە جار هەیە وشتری شیردەر سەتڵی شیرەکە پڕ دەکات.

## جەنگی خەواریجەکان

لەو سەروبەندە پڕ کێشەو ئاڵۆزیەدا، خەواریجەکانیش دەرکەوتن و گەیشتنە ئەوەی راشکاوانە حوکمی کوفری عەلی کوڕی ئەبوطالیبیان دەدا، دروشمەکەیان ئەوەبوو دەیانوت حوکم تەنها بۆ خوایە، هەرچەندە عەلی دەیویست تێیان بگەیەنێت کە بیری ئەوان دەرچوونە لە ئیسلام، چونکە پەیامی حوکمی خوایان دروست بوو، بەڵام جۆری گەیشتن بەوە لە دەرچوون لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە عەلی ئامادە نەبوو بەرنامەکەی ئەوان پەیڕەو بکات، کەوتنە دژایەتی کردن و قسەپێ وتنی، بەڵام عەلی هەر نەرمی دەنواند بەرامبەریان و دەیوت مزگەوتتان لێ قەدەغە ناکەین و پشکی خۆتان پێ دەدین و لەگەڵتان ناجەنگین مەگەر ئێوە دەست بکەن بە جەنگ، لەولاوە سەرکردەکانی خەواریج لە کووفە بڕیاریان دا لە کووفە بچنە دەرەوەو لە ناوچەی نەهرەوان کۆببنەوەو لەوێوە پەل بهاوێژن، لەوێ کۆبوونەوەو بەهێز بوون، کاتێکیش بڕیاری

دادوەریەکەیان پێ گەیشت، ئەوەشیان بەرپەرچ دایەوە، هەروەها کەوتنە کوشتار و ئاژاوە نانەوە، بەتایبەت کوشتنی عەبدوڵای کوڕی خەبباب و هەڵدڕینی سکی ژنەکەی، کە عەلی ئەمەی بیست، ئیتر بڕیاری دا هێرش بباتە سەر خەواریج و لەگەڵیان بجەنگێت، سوپای کۆکردەوەو لە رووبار پەڕیەوەو خۆی گەیاندە لای خەواریجەکان، سەرەتا داوای کرد ئەوانەی بەشدار بوون لە کوشتاری خەڵکدا تەسلیم بکرێن تا تۆڵەیان لێ بکرێتەوە، کەچی ئەوان رازی نەبوون، ئەوانیش وتیان هەمووومان بکوژین و خوێنی ئێوەشمان لا حەڵاڵە، هەریەك لە ئەبووئەیووبی ئەنصاری و سەعدی کوڕی عوبادە هەستان و ئامۆژگارییان کردن، بەڵام سوودی نەبوو، دواتر عەلی خۆی قسەی بۆ کردن، کەچی هەر وازیان نەهێنا، دواجار جەنگێکی سەخت لەنێوانیاندا روویدا و تیایدا خەواریجەکان شکان و کوشتارێکی زۆریان لێ کرا.

## شەهیدکردنی پێشەوا عەلی

ئەمیری باوەڕداران عەلی بارێکی سەختی تووش بووبوو، لەلایەکەوە شپرزی سوپاکەی و لەلایەکی ترەوە سەرکەشی عێراقیەکان و لەولاوە کێشەی موعاویەو لەلایەکی تریشەوە بوونی خەواریجەکان، ئیتر عەلی وای لێهات بێزار بوو لە ژیان تا ئەوەی ئاواتی بە مەرگ دەخواست، هاوکات دڵنیا بوو لەوەی بە شەهیدی دەمرێت نەك بە مردنی ناو جێ، تەنانەت کە خەواریجەکان پێیان وت لەخوا بترسە تۆیش دەمریت، وتی نابەخوا نامرم بەڵکو ئەم ریشەم سوور دەبێت بە خوێن.

سێ کەس لە خەواریجەکان کە بریتی بوون لە ئیبنولمولجەم و بەرکی کوڕی عەبدوڵا و عەمری کوڕی بەکر کۆبوونەوەو باسی کوشتاری هاوڕێکانیان لە نەهرەوان کرد، بۆیە بڕیاری تۆڵەیان دا و ریککەوتن لەسەر ئەوەی هەرکامیان و یەکێك لە سەرکردەکان بکوژێت، ئیبنولمولجەم وتی من عەلی دەکوژم، بەرك وتی منیش موعاویە دەکوژم، عەمریش وتی منیش

عەمری کوڕی عاص دەکوژم، ئەوەبوو هەرسێیان بەڵێنیان بە یەکدی دا و شمشێرەکانیان ژەهراوی کرد و وادەی حەقدەی رەمەزانیان دانا، ئیبنولمولجەم چوو بۆ کووفەو خۆی شاردەوە لە خەواریجەکانی ئەوێ، جارێك یەکێك لە کچی خەواریجەکان کە ناوی قوطام بوو و باوك و برای لە نەهرەواندا کوژرابوون و ئافرەتێکی زۆر جوان بوو و چووبوویە مزگەوت و خۆی یەکلاکردبوویەوە بۆ پەرستش، ئیبنولمولجەم ئەم ئافرەتەی بینی و داوای کرد، بەڵام ئەو رازی نەبوو، تا دواجار سێ مەرجی بۆ دانا، هەزار درهەم و خزمەتکارێك و رێی کوشتنی عەلی، ئەویش وتی دەی بەخوا بەس بۆ ئەوە هاتوومەتە ئەم شارە، ئەوەبوو مارەی کرد و گواستیەوە، قوطامیش بەردەوام هانی دەدا و کەس و پشتیوانیشی بۆ پەیدا کرد، ئەوەبوو لە کاتی دیاریکراودا ئیبنولمولجەم هاودەم بە دوو پشتیوانی کە (وەردان و (شەبیب) بوون چوونە سەر رێی عەلی، کە عەلییان بینی خەڵکی بێدار دەکردەوە بۆ نوێژ، شەبیب هەڵمەتی بۆ برد و

شمشێرێکی لێدا، ئیبنلمولجەمیش شمشێرێکی لێدا و خوێن ریشی سوور کرد، ئینجا ئیبنولمولجەم دەیوت حوکم تەنها بۆ خوایە ئەی عەلی، نە بۆ تۆ و نە بۆ هاوەڵەکانت، عەلیش هاواری کرد بیگرن، وەردان رایکرد و کابرایەکی حەضرەمەوتی خۆی پێگەیاند و کوشتی، شەبیبیش رایکرد و رزگاری بوو، ئیبنولمولجەمیش گیرا، جەعدەی کوڕی هوبەیرە نوێژەکەی بەیانی بۆ خەڵکەکە کرد و عەلی برایەوە ماڵەوە، ئیبنولمولجەمیش برا بۆ لای، عەلی وتی ئەی دوژمنی خوا مەگەر من چاکەم لەگەڵ نەکردیت؟ وتی با، وتی ئەی بۆ واتکرد؟ وتی چل رۆژە ئەو شمشێرە ئامادە دەکەم و داوام لە خوا کرد خراپترین کەسی پێ بکوژێت، عەلی وتی خۆتیت بەوە دەکوژرێیت، تۆیش خراپترین کەسەکەیت، ئینجا وتی ئەگەر مردم ئەوە بیکوژن و ئەگەریش خۆم ژیام دەزانم چی پێ دەکەم، جوندوبی کوڕی عەبدوڵا وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران بەیعەت بدەین بە حەسەن؟ فەرمووی نە فەرمانتان پێ دەکەم و نە

ڕێگریتان لێ دەکەم، خۆتان باشتر دەزانن، ئیتر بەردەوام دەیوت لا اله الا الله و هیچی تری نەدەوت.

ئەمەش ئاماژەیە بەوەی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب راوێژی پێ ڕەوا بووە نەك دەسەلآتی بنەماڵەیی و پشتاوپشتی.

پاشان عەلی هەریەك لە حەسەن و حوسەینی بانگ کرد و ئامۆژگاری کردن و وەسیەتی بۆ کردن تا لەخواترس بن و دنیا لەخشتەیان نەبات و قسەی حەق بڵێن و کار بکەن بۆ ڕۆژی دوایی و نەیاری ستەمکار و سەرخەری ستەملێکراو بن و کار بە قورئان بکەن و لەبەر خوا ترسیان لە لۆمەی لۆمەکاران نەبێت، ئینجا بە موحەممەدی کوڕیشی وت هەمان ئامۆژگاریشم بۆ تۆ هەیەو داواشم لێتە ڕێز لە براکانت بگریت چونکە مافیان بەسەرتەوە زۆرە، داوای کرد لە حەسەن و حوسەینیش چاك بن لەگەڵ موحەممەد چونکە برایانە و خۆشەویستی باوکیانە.. ئینجا ڕوویکردە حەسەن و وتی کوڕی خۆم وەسیەتت بۆ دەکەم لەخواترس بیت و نوێژەکان لە کاتی

خۆیدا بکەیت و زەکات لە کاتی خۆیدا بدەیت و جوان دەستنوێژ بگریت چونکە نوێژ بە پاکی قبوولّە، نوێژی زەکات نەدەر دروست نیە، لێبوردنت هەبێت بۆ تاوانکار و قین و تووڕەییت بخۆرەوەو پەیوەندی خزمایەتیت بەتین بکە و لەگەڵ نەزاناندا لەسەرخۆ بە و شارەزای ئایین بەو خۆراگربە لەسەر دینداری و پەیوەستی قورئان بەو دراوسێیەتیت چاك بێت و فەرمان بکە بە چاکەو ڕێگری بکە لە خراپە و دوور بە لە خراپەو داوێن پیسی.

دوای وەسیەتەکەی یەك قسەی نەدەکرد جگە لە لا الە الا اللە تا وەفاتی کرد.

بشکێ دەستی گلاّوی ئیبنولمولجەم کە مەولای باوەڕداران و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ و موژدەپێدراوی بەهەشت و خەلیفەی موسڵمانانی بەو دەردە برد و بە هەموو عەقڵێکی بەتاڵی خۆیشی چاوەڕێی پاداشتی خوایی بوو، بوەستێ هەر دڵێ کە خۆشحاڵ دەبێت بەو کارەی ئیبنولمولجەم.

ئینجا کە عەلی وەفاتی کرد حەسەن هەستاو وتارێکی پێشکەش کرد بە خەڵکەکەو تیایدا وتی: دوێنێ کەسێك جێی هێشتن کە پێش خۆی و پاش خۆیشی هێندەی ئەو زانستیان نەبوو، پێغەمبەر ﷺ کە ئاڵای دەدایە دەست پشتی هەڵنەدەکرد تا ئەو شوێنەی فەتح دەکرد، جبریل لە لای راستیەوە بوو و میکائیل لە لای چەپیەوە بوو، تەنها شتێك پاش خۆی جێی هێشتبێت حەوت سەد درهەم بووە کە لە مووچەکەی پاشەکەوتی کردووە، دەیویست بەو پارەیە خزمەتکارێك بکڕێت شەوێك کوژرا کە تیایدا قورئان دابەزیوە، تیایدا عیسا بەرزکرایەوە، تیایدا مووسا گیانی سپارد)، حەسەن و حوسەین و عەبدوڵای کوڕی جەعفەر تەرمەکەی عەلییان شۆرد ئینجا حەسەن نوێژی لەسەر باوکی کرد.

شەهیدکردنی عەلی لە شەوی حەڤدەی مانگی رەمەزانی ساڵی چلی کۆچیدا بوو، ماوەی خیلافەتەکەی چوار ساڵ و هەشت مانگ و نیو بوو.

## كۆتایی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەستەی هەڵبژێردراو بوون بۆ وەرگرتنی پەیامی الله تعالى و بەجێگەیاندنی لەبەردەستی سەرووەرماندا و ئەزموونکردنی لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان، لەوەشدا نموونەی باڵا بوون و توانییان الله لە خۆیان ڕازیی بکەن و دەقەکانی قورئان و فەرموودە ئەستۆپاکییان بسەلمێنن.

جێی سەرنج بوو بۆم کەسانێك کە توانیبێتیان الله تعالى لە خۆیان ڕازیی بکەن، بتوانن کۆتا پەیام لە کۆتا پێغەمبەرەوە ﷺ وەربگرن و بە ئەمانەتەوە بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەمڕۆ ئێمە لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوەی ئەوان سەرقاڵی دینداریی بین، دەکرێت چەند وانەیەکیان لێوە فێر ببین بۆ ژیانمان، بەڵکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان الله لە خۆمان ڕازیی بکەین و خزمەتێك بە نەوەی دوای خۆیشمان بکەین.

ئێمە بە دەقی قورئان ڕێنمایی کراوین پێشەنگیی بکەین بە پێغەمبەرانی خواوە ﷺ، وەك لە قورئاندا هاتووە (فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهِ)، هەروەها ڕێنمایی کراوین پێشەنگی بە کۆتا پێغەمبەرەوە بکەین ﷺ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)، هاوەڵان یەکەم نموونە بوون کە توانییان ئەم پێشەنگییانە جێبەجێ بکەن و خوای گەورەش شایەتییان بۆ بدات و لێیان ڕازیی بێت، واتە براوە بون، دەبێت ئێمەش پێشەنگیمان بە هاوەڵانەوە هەبێت و لە شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان وردبیینەوە، بزانین چۆن توانییان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە بە پەیامەکە بدەن و دینی الله تعالی بگەیەنن بە سەرجەمی مرۆڤایەتیی؟ ئاکار و ڕەفتاریان چۆن بوو؟

ئەگەر بتوانین لە ژیانی هاوەڵان و هۆکاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەلایەن ئەوانەوە بکۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام، پاشان هەمان ڕێڕەو لە ژیانماندا بگرینەبەر، پشتیوان بە الله تعالی ئێمەش دەتوانین بگەین بە ڕەزامەندیی پەروەردگار.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.



# سەرچاوە

- البداية و النهاية لابن كثير.

- الإصابة في تمييز الصحابة

- العواصم من القواصم.

- أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

- سير أعلام النبلاء للذهبي

- الطبقات الكبرى لابن سعد،

- الإستيعاب في معرفة الأصحاب،

- المعجم الكبير للطبراني،

- السيرة النبوية لابن هشام